ڕوڤار 39

# عەرەب شەمۆ

## هەیڤێ لەئاسمانی قەلای دمدمدا

نیگاری: ستار قادر

بلاوکراوەیەکی رۆشنبیریەو هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێک
دەزگای چاپو پەخشی سەردەم دوو مانگ جارێک دەریدەکات



سەرپەرشتیاری گشتی
شێرکۆ بێکەس

ڕاوێژکار
ئەکرەم قەرەداخی

سکرتێری ڕۆڤار
یاسین عومەر

سەرپەرشتیاری هونەری
قادر میرخان

مۆنتاژی کۆمپیوتەر
ئاسۆ سەعید

سەرپەرشتیاری چاپ
فەرهاد ڕەفیق

ڕۆڤار بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوومانگ جارێك دەریدەکات

ناونیشان
سلێمانی- فولکەی یەکگرتن
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
ت: ٣١٢٩٦٠٩

لە دەرەوەی وڵات
Tel: 00441628477660
Fax: 00441628486008

Web Site
www.sardam.info

Email
Sardam@sardam.info

چاپخانەی ڕەنج





## ستار قادر

ساڵی ١٩٦٨ لە سلێمانی لەدایکبووە.
ساڵی ١٩٨٩ پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی تەواوکردوە. بەشداری چەندین پیشانگەی شێوەکاری هاوبەشی هونەرمەندانی سلێمانی کردوە، ئەمەجگە لەوەی تا ئێستا شەش پیشانگەی تایبەتی کردۆتەوە، کە بریتیت لە:
ساڵی ١٩٨٧ لە هۆڵی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی. ساڵی ١٩٨٩ لە هۆڵی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی. ساڵی ١٩٩٨ لە هۆڵی مۆزەخانە سلێمانی. ساڵی ٢٠٠٣ لە هۆڵی مۆزەخانە سلێمانی بە ناوی بەربوونەوە. ساڵی ٢٠٠٥لە گەلەری ئارام بەناوی هاوارە بێدەنگەکانی چاو. ساڵی ٢٠٠٦ لەهۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی بەناوی ئاشقە مەبە گەر دەتوانیت.

## ژمارەکانی ڕابردوو

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارەی ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم موحەمەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەلانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، جەلالی میرزا کەریم، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری جەلال تەقی، حەمە ساڵح دیلان، هەژار، شاکیر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەمەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەمەد، مەحمود مەلاعیزەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵلا پەشێو، جگەر خوێن، بابەتاهیری عوریان.

# کورتەیەک سەبارەت بە ژیانی عەرەب شەمۆ

ئامادەکردنی: شکۆ تۆفیق

بەبۆنەی تێپەڕبونی هەشتا ساڵ بەسەر لەدایکبوونی کەڵە نوسەری کورد (عەرەب شەمۆ)، لەشاری (یەریڤان) پایتەختی ئەرمەنستان ئاهەنگێکی (ڕێزلێنان) ڕێکخرا. هەرچی دەزگا حکومی و ڕۆشنبیرانەو کارەکتەرە زانستی و ئەدەبیە هەڵکەوتوەکان هەبو بە یەکێتی نوسەرانی سۆڤێتیشەوە ئامادەیبون و بە وتارو دیاری بەشدارییان تێداکرد. تیایدا چالاکی و پێشنیار و تواناکانی نوسەریان بەرچاوخست و ڕونکردنەوەیان لەسەردا. سەرۆکایەتی یەکێتی نوسەران بەنامەیەکی پۆستکراو یادەکەی دەوڵەمەندکرد، بەوتارێك لە ئاهەنگەکەدا بەشداری کردو پاشان هەمان وتاریان لە ڕۆژنامەی (لێترا تۆرنایا گازاتا) بڵاوکردەوە، کە (زمانحاڵی یەکێتی نوسەرانە لە سۆڤێتدا) و بە یەکێ لەبەناوبانگترین ڕۆژنامەی ئەدەبی دەژمێردرێ لە جیهاندا. لە نامەکەدا نوسەریان بەدامەزێنەرو ڕاگری ئەدەبی کورد و بە ئامادەکار و کمپۆزێشنەرێ بۆ (ئەلفوبا) بە لاتینی بۆ زمانی کورد داناوە. هەروەها بە کارەکتەرێك ڕۆشنبیرانەو هۆشیارانە ناسێنراوە. تیایدا پەنجە بۆ گشت چالاکی و شاکارە ئەدەبی و هونەرییەکانی درێژکراوە و بە بەهاوە نرخێنراوە.

لەهەمان کاتداو لەهەمان ئاهەنگدا پەرلەمانی گەورەی سۆڤێت (خەڵات)ێکی پلە بەرزی بەخشییە (عەرەب شەمۆ) کە بووە مایەی خۆشی و دەنگدانەوە لەدڵ و دەرونی گشت ڕۆشنبیران و نوسەرانی کورد لە هەر شوێنێکدا بوبێت.

پاش ئەوەی (یەکێتی سۆڤێت) هەڵوەشێنرا و کۆمارەکان لەیەك جیابوونەوە، بەشێکیان بەهەر هۆیەك بوبێ دژایەتی کەوتە نێوانیانەوە، لەناویاندا ئەو دوکۆمارە بوو کە میللەتی کورد بوە هێڵی سنوردار لە نێوانیاندا، بەو هۆیەشەوە کوردی ئەو ناوچەیە توشی جەنگ بون و ئاوارەکران. بەو هۆیەوە ساڵی ١٩٩٧ کە ڕێکەوت بوو لەگەڵ یادی (١٠٠) ساڵەی لەدایك بوونی عەرەب شەمۆ، نەتوانرا ئەو یادە ڕێکبخرێت، بەڵام ئامادەکردنی ئەم چەند لاپەڕەیە یادکردنەوەیەکی بێدەنگانەو بچوکە بۆ ئەو کەڵە نووسەرەو پیاوە گەورەیە.

### شوانە کوردێك چاوی کەوتووە بە لینین

ناوی تەواوی ( عەرەب شەمسەدین شامیلۆڤ )ە و خێزانەکەیان لە شێخانی( یەزیدی )ن . ڕۆژی ٢٣ ی کانونی دووەم ساڵی ١٨٩٧ لە گوندی ( سۆسیز ) ئەو گوندەی کەوتۆتە ناوچەی (قارس)ەوە و سەر بە کوردستانی تورکیایە ( بۆ ماوەیەك هێزەکانی ڕوسیا داگیریان کردبوو) هاتۆتە دنیاوە .



عەرەب شەمو و خێزانەکەی

بەهۆی ئەو بارە ناهەموارەی کە بەسەر خێزانەکەیاندا هاتوە ، هەر لە منداڵیەوە ناچار بووە کارو ئیشی جۆراو جۆر بکات . لە سەرەتاوە لای (ئاغا کوردەکان و تورك و ئەرمەنە دەوڵەمەندەکان) شوانێتی کردووە، پاشان لە یەکێ لە کارگەکاندا بەکرێ کاری کردووە . لەگەڵ ئەو کارانەشدا توانیویەتی چەند قۆناغێکی خوێندن ببڕێت و (خوێندنی سەرەتایی) تەواو بکات . ئەم جۆرە خوێندنەش سیستمێکە (سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی) بەیەك قۆناغ دادەنێت و تا ئێستاش لە خوێندنگاکانی ڕوسیادا پەیڕەو دەکرێت . بۆچوون هەیە کە عەرەب شەمۆ لە یەکێ لە خوێندنگا ڕوسیەکانی ئەو ناوچەیە خوێندبێتی و بەهۆیەوە فێری زمانی ڕوسی بووبێ لە پاڵ ئەو زمانانەی تر کە دەیزانی ( کوردی، تورکی، ئەرمەنی ، یۆنانی " گریکی ") چونکە ناوچەی (قارس) ناوچەیەك بووە کۆمەڵێ نەتەوەی بەیەکەوە تیا ژیاوە .

عەرەب شەمۆ بۆماوەیەکی کەم لە ناوچەکەدا ولە ڕۆژانی جەنگی جیهانی یەکەم وەك وەرگێڕێك لە لای ڕوسییەکان کاری کردووە . هەرلەو ڕێیەشەوە چۆتەڕیزی یەکێك لە شانە ڕێکخراوەکانی(بەلشەفیك)، کە ڕەگیان لەناو سوپادا بڵاوکردبۆوە. پاش بەشدار بوونی لە یەکێ لەو خۆپیشاندانانەی دژی ڕژێمی قەیسەری دەکران لەگەڵ سەرکردەکانی خۆپیشاندانەکە دەستگیر کرا . بەڵام هەر بە زوویی بەردرا کاتێ دەرکەوت کە کوردە . یەکێ لە ئەفسەرەکانی پێی وتوە نابێ کورد بەلشەڤ بێت . نوسەریش (لە نوسینەکانیدا بێت یا هەڤپەیڤینی ڕۆژنامەوانانە) لە زۆر کات و شوێندا ئەم ڕوداوەی گێڕاوەتەوە . بەڵام ئەو ئەفسەرە ڕوسیە بە هەڵەدا چوو بوو ، چونکە چەند مانگێکی کەم تێنەپەڕی کە بە دوایدا شۆڕش لە ئۆکتۆبەری ١٩١٧ دا هەڵگیرسا عەرەب شەمۆش گوازرایەوە بۆ شاری ( ستافرۆبۆل )و چووە پاڵ ( سوپای سوور )، لەوێ بەشداریکرد لە شەڕی دژ بەو هێزە بیانیانەی دژایەتی شۆڕش و (حکومەتی بەلشەفیك ) یان دەکرد .

بە درێژایی ژیانی لەسەر ئەو باوەڕە مایەوە کەسۆشیالیزم تاکە ڕێگەی ڕزگاربون و بەختیارییە بۆ گەلانی سەر زەوی .هەر ئەم ئیمانەش بوو وای لێکرد لە ساڵی ١٩١٨ دا بچێتە پاڵ پارتی بەلشەفیك . بەوەش دەکرێ بەیەکەم مارکسی دابنرێ لە کوردا کەچوبێتە نێو پۆلەکانیەوە لە کاتێکا چارەنوسی شۆڕشی بەلشەفیك نادیار بوو . بەڵام پاش گەڕانەوەی ئاشتی و ئاسایش بۆ نیشتمان، عەرەب شەمۆ لە مۆسکۆی پایتەخت چووەتە پەیمانگای (لازاریف بۆ زمانە ڕۆژهەڵاتیەکان ) و ساڵی ١٩٢٤ بە (پلەی بەرز ) دەرچوو .

لە ماوەی خوێندنیدا لە پایتەخت بوارێکی وای بۆ ڕەخسا کە چاوی بە سەرکردەی شۆڕش (ڤلادیمێر لینین ) بکەوێ. ئەم چاوپێکەوتنەشی لە یاداشتەکانیدا تۆمار کردووە و لە وتەکانیدا بە شکۆمەندی و پایەبەرزانە نرخاندویێتی . زانراویشە کە عەرەب شەمۆ لە نێوان ساڵانی تێکۆشانیدا پێش هەڵگیرساندنی شۆڕش (کیرۆڤی سەرکردە)ی ناسیوەو هەر ئەویش یارمەتیداوە بچێتە پەیمانگای لازاریف .

عەرەب شەمۆ پاش دەرچوونی لە پەیمانگا گەڕاوەتەوە (یەریڤان )، لەوێ یەکسەر بووەتە جەمسەرێك چالاکانە و پتەو بۆ زۆرێك لە بوارەکان کە گەلی کورد لەوکاتەدا پێویستی بوە وبۆی دابین نەکراوە ، لەبەرئەوە بەرپرسیارێتی و بەدواداچونی لەناو (لیژنەی مەرکەزی حیزبی بەلشەفیکی ئەرمەنی) دا بۆ کێشە کوردییەکان کردووە . بۆ ئەو مەبەستەش لە گوند و ناوچە کوردیەکانی ئەرمەنستاندا گەڕانی دەست پێکردووە بۆ هۆشیارکرنەوەی ڕۆشنبیرانەو سیاسیانەو کۆمەڵایەتیانە ، لە دەرئەنجامی ئەوەشدا لە دروستکردنی خوێندنگا کوردییەکاندا بەشداربووە وپێداویستیەکانی دابین کردوون هەروەها بۆ قەڵاچۆکردنی نەخوێندەواری و دواکەوتن هەوڵیداوە کە لەو کاتەدا لە ناو ڕۆڵەی میللەتەکەیدا بەربڵاو بووە . هەوڵی ڕزگار کردنی ئافرەتی داوە و هاریکاریکردوون بۆ کارکردن و بەشداربونیان لە هەمو بوارەکانی زانست و ڕوناکبیری . بۆ ئەم مەبەستەش زنجیرەیەك وتاری بڵاوکردۆتەوە دەربارەی چالاکییەکانی و پێشنیارەکانی بۆ باشتر کردن و پێشکەوتنی کۆمەڵگای کورد لە ناوچە کوردییەکانی پشت ( قەفقاز ) ، ئەم وتارانەی ( کە وتارەکانی نوسەری میسری ( سەلامە موسا ) مان دەهێنێتەوە یاد) بۆ ژیانەوە و هەستانەوەی نەتەوەکەی تێدەکۆشا بۆ ئەوەی لە میللەتانی پێشکەوتوو دانەبڕێت.

لە لایەکی ترەوە عەرەب شەمۆ زۆر گەڕاوە بۆ کۆکردنەوەو تۆمارکردنی شاکارە فۆلکلۆرییەکانی کورد لە داستانە شیعرییەکان و چیرۆك وحیکایەتە میللییەکان و چیرۆکە ئەفسانەییەکان، چونکە بەلای نوسەرەوە هۆشیارکردنەوەی نەتەوەکەی کەم بەهاتر نییە لەداهێنانێکی شاکارانەی هونەرو ئەدەب . بۆیە توانیویەتی پارسەنگی نێوان تێکۆشانە شۆڕشگێڕانەکەی و داهێنانە ئەدەبییەکەی بکات وجۆرە هارمۆنییەکی نەرم بخاتە نێوان ئەوبەها فیکری و ئیستاتیکیانەی کە باوەڕی پێ هەبوو، بۆشی تێدەکۆشا . ئەم جۆرە پارسەنگی وهارمۆنییە لە لای زۆربەی داهێنەرانی سەدەی بیستەم ڕوونە و دەبینرێ وەك پابلۆ نیرۆدا ، ئیلیا ئاهنبۆرگ ، ڕەسول هەمزاتۆڤ ،......هتد .

## عەرەب شەمۆ و هونەری ڕۆمان

لە مێژووی ئەدەبی کورد دا دەکرێت ساڵی ١٩٣٠ بە سەرەتا دابنرێت بۆ سەرهەڵدانی ( ڕۆمان )ی کوردی ، ئەو ساڵەی کە عەرەب شەمۆ یەکەم ڕۆمانی بەناوی ( شوانە کوردەکە )

بڵاوکردۆتەوە ، چونکە بەپێی هەموو ئەو چەمك و مەرجانەی ڕەخنە گران و توێژەرانی ئەدەب دیاریدەکەن یەکەم ڕۆمانی کوردییە ئەو مەرجە هونەری و ئەدەبیانەی تیا بەدیدەکرێ .

ئەم ڕۆمانە بەهەموو پێوانەیەکی هزرانەو ئێستاتیکانە ڕۆمانێکی سەرنجڕاکێش و سەرکەوتووە . بەجۆرێ کە بەلای خوێنەرانەوە سەیربووە ( نوسەرەکەی) لەدایکبووی ناوچەیەکە چەپەك و دواکەوتوو ، بەشێکی زۆر لە خەڵکەکەی نەخوێندەوار ، بێبەش لە خوێندن و زانست .. بتوانرێ داهێنانێکی ئاوهای لێ هەڵبهێنجرێ. هەر بۆیە لە ماوەیەکی کەم دا پاش بڵاوبوونەوەی بەزمانی کوردی (کرمانجی ژوورو ) ئەم ڕۆمانە وەرگێڕدرا یە سەر زمانی ڕوسی و ساڵی ١٩٣١ لە چاپدراو پاشان بڵاوکرایەوە . بەدوای چەند ساڵێکیش بۆ زمانانی تری کۆمارە یەکگرتوەکانی ئەوکاتەی سۆڤیت تەرجەمە کرا .

نزیکەی سی(٣٠) ساڵە گفتوگۆ و لێکۆڵینەوە دەکرێ دەربارەی (سەرهەڵدانی ڕۆمان ) لە ئەدەبی کورددا و بۆچوونی جیاواز هەیە لەو بارەیەوە ، بۆ نموونە هەندێ لە مێژوونووسانی ئەدەبی کورد چیرۆکەکەی جەمیل سائیب ( لە خەوما ) بەسەرەتا دادەنێن ، هەرچەندە ئەم چیرۆکە زیاتر لە ڕیپۆرتاژێکی ڕۆژنامەوانێك دەچێت کە لە ساڵی ١٩٢٥ بەشێوەی زنجیرە لە ڕۆژنامەی ( ژیان ) دا بڵاو دەکرایەوە ، نەك لە پەخشانێکی هونەری چیرۆکئامێز یا ڕۆمانئامێز. هەندێکیشیان چیرۆکەکەی ئەحمەد موختار جاف (مەسەلەی ویژدان ) بەسەرەتا دەزانن لەکاتێکا ئەحمەد موختار لە کۆتایی ساڵانی بیستدا ( لەسەدەی ڕابردودا ) نوسیویەتی و لەبەر هەندێ هۆی نەزانراو تا ساڵی ١٩٦٩ چاپنەکراوە و بڵاو نەکراوەتەوە، جا لەبەرئەوە ئەم چیرۆکە هیچ کاریگەرییەکی نەبووە بۆ سەرهەڵدان و پێشکەوتنی ڕۆمان لە ئەدەبی کورددا . دیارە(مەسەلەی ویژدان) وەك ڕۆمانێکی کورت یا چیرۆکێکی درێژ لە گۆشەنیگایەکی ورد و زیرەکانەوە بەشێوەیەك ڕەخنە ئامێزو کۆمیدیانە لە دیاردەی دواکەوتن و نەخوێندەواری ناو کۆمەڵگای کورد دواوە و ڕاستیانە خستویەتیە ڕو . بەڵام ئەمانە هەمووی ئەوە ناگەیەنێت ببنە سەرەتا بۆ سەرهەڵدانی ڕۆمان لە ئەدەبی کورددا . بەهەر جۆرێك بێ لە ڕووی ئاستی هونەری و ئێستاتیکانەوە ناگەنە ئاستی ( شوانە کوردەکە) ی عەرەب شەمۆ چونکە باری ڕۆشنبیری و سیاسیانەی کورد لە ئەرمینیای ئەو کاتە لەجێگاکانی تری کوردستان گونجاوتر بووە بۆ گەشەکردنی ئەم جۆرە هونەرانە ، ئەمە لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە عەرەب شەمۆ بەپێی توانا و مەوهیبە هۆشیاریانەکەی و خوێندنەوەو بەئاگا بوونی لەسەر ئەدەبی ڕوس و ئەوروپا لەو کاتەدا یارمەتیدەر و پاڵ پێوەنەرێکی باش بوون بۆ سەرهەڵدانی ئەو هونەرە لەو کات و شوێنەدا .

چونکە دەکرێ هەمان ساڵ کە ڕۆمانی ( شوانە کوردەکە )ی تیا بڵاوکرایەوە بەسەرەتای سەرهەڵدانی ( شانۆ نامە )ش دابنرێ ، بەوەی عەرەب شەمۆ یەکەم شانۆنامەی بەناوی ( قەشە دورووەکە)ی نووسیوە و لەهەمان ساڵیشدا بڵاویکردۆتەوە .

لەساڵی ١٩٣٦ دا عەرەب شەمۆ دووەم ڕۆمانی بڵاوکردۆتەوە . بە بەراورد لەگەڵ ڕۆمانی ( شوانە کوردەکە )دا لە ڕووی ( هزرو هونەرو ئێستاتیکای ڕۆمانەوە ) پرتر و پێشکەوتوانەترە ، بەجۆرێك کە چووە ئاستی ڕۆماننووسە دەرکەوتوەکانی سۆڤێت . پاشان ڕۆمانی ( کازیوە )ی بڵاوکردەوە ، لەوەئەچێ سێیەم ڕۆمانی لە قۆناغێکدا نوسیبێ کەئاوارە وزیندانی بوە لە سیبیریا بەوەی لەگەڵ گەڕانەوەیدا ئەم ڕۆمانە بڵاوکرایەوە .پاش ئەو ڕۆمانانە عەرەب شەمۆ ساڵی ١٩٥٩ ڕۆمانی (ڕێگەی بەختیاری) و ساڵی ١٩٦٦ (قەڵای دمدم) نوسی و بڵاوکرایەوە .

لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێم کە عەرەب شەمۆ و بەرهەمەکانی کەم وێنەن چ لە ڕووی ئەدەب و هونەرەوە بێت یا لە ڕووی چالاکی وتێکۆشانییەوە بێ . بەگشتی دنیای ناوەوە لە نوسینەکانی عەرەب شەمۆدا دنیای مرۆڤی کوردە بە هەموو سیماو بەها ڕوحی وتایبەتمەندیەکانییەوە سەرەڕای هەوڵدان و تێکۆشان بۆ ئایندەیەك باشتر وئاوەدانتر .



# عەرەب شەمۆ: هەیڤی پرشنگداری قەڵای دمدم

هێمن

بەدرێژایی مێژووی نەتەوەی کورد، هەر کارەساتێکی گرنگی سیاسیو مێژوویی، هەر ڕووداوێکی کۆمەڵایەتی بەرچاو، هەر چیرۆکێکی تاڵ و شیرینی دڵداری ۆ هەر شایی و شینێکی گەورە لە هەر مەڵبەندێکی کوردستان قەوماوە، خۆوێژو خۆشخوانە کوردە نەناسراوو نەخوێندەوارەکان لەسەر کێشی برگەیی خۆمانە بە زمانێکی ساکار، بەڵام پۆخت و پاراوو ڕەسەن و ڕەوان، هۆندوویانەتەوەو ئاهەنگێکی تایبەتی خۆشیان بۆ داناوەو پێیان گوتوە بەیت[1].

شایەرو بەیت بێژەکان ئەو بەیتانەیان لە کۆڕی دیوەخانی مەزنان، لەلا مێردانی گەورە پیاوان و لە گۆشەی مزگەوتی گوندان و لە چایخانەو کاروانسەرای شاران بۆ خەڵکی تینوو و تامەزرۆ گوتوە، بەم جۆرە هەم نەیان هێشتوە ڕوداوو کارەساتەکان لەبیر بچنەوەو هەم زمان و فەرهەنگ و ئەدەبی فۆلکلۆری کوردییان ڕۆژبەڕۆژ دەوڵەمەند و دەوڵەمەندتر کردوە.

ئەم بەیتانە سینگ بە سینگ و پشت بە پشت پارێزراون. دیارە بەپێی جێ و کات و وەستایی و ناوەستایی شایەر کەم و زۆر گۆڕانیان بەسەردا هاتووە. زیادو کەم کراون، وشەی تازەو نوێ و باویان هاتۆتە نێوو وشەی کۆن و سواویان لێ دەراوێژراوە. بەڵام ناوەرۆکی مەبەست هەر وەك خۆی ماوەتەوە.

لە سەردەمی ئێمەدا کە جیهان ئاڵو گۆڕێکی سەیرو بەپەلەی بەسەردا هاتوە، زانست ڕۆژ بەڕۆژ پتر بەسەر تەبیعەتدا زاڵ بووە، ئینسان شەپۆلی هەوای خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆی و ئاتۆمی قەڵشاندووەو لەسەر مانگ دابەزیوە. هەرچەند وەزعی ناڵەباری کوردستان گۆڕانێکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتوەو نەتەوەی کورد



هەروا لە کاروانی شارستانەتی بەجێماوەو تەمومژی نەزانی و نەخوێندەواری لە ئاسمانی وڵاتەکەمان نەڕەویوە، بەڵام ئەگەر نووری کارەبا کوردەواری ڕووناك نەکردۆتەوە، ڕادیۆو گرام و ڕیکۆردەر گەیشتوونە کوێرەدێیەکانی کوردستانیش و دەتوانین بڵێین تیشکی زانستی دەرەوە ناڕاستەوخۆ کوردستانیشی گرتۆتەوە.

بەرنامەی ڕادیۆکان و ئیستیوانەی گرام و شریتی ڕیکۆردەرەکان خەڵکیان لە بەیت و باوی شایەرە هونەرمەندەکان بێ نیاز کردوە. بۆیە مەترسی ئەوە زۆرە شاکارە بە نرخەکانی ئەدەبی فۆلکلۆریمان

---

[1] بە بڕوای من ئەم وشەیە هیچ پەیوەندی بە (بیت)ی عەرەبییەوە نییەو ڕای مامۆستا فەتاحی قازی بەڕاست دەزانم کە دەڵێ: ڕەنگبێ لە وشەی بەیاتەوە هاتبێ کە ناوی ئاوازێکە.

ورده ورده لەبیرچنەوەو لەبیرچوونەوەشیان زیانێکی زۆر گەورە لە زمان و فەرهەنگ و مێژووی نەتەوەکەمان دەدا. هەرچەند زانایان و رووناکبیرانی کورد لە هەموولاوە هەستیان بەو مەترسییە کردووەو هەرکەس بەپێی هێزو تواناو کات و دەرفەتی خۆی خەریکی کۆکردنەوەیانن، بەلام بەداخەوە دەرۆست نایەن وپێشگرییان بۆ ناکرێ.

یەکێك لە کارەساتە هەرە گەورەو خوێنیاوییەکانی مێژووی نوێی کوردستان کەپاش دابەشکرانی ئەو ولاتە لەنێوان عوسمانی و قزلباش دا روویداوە، گەمارۆدران و گیرانی قەلای دمدم و شەهیدبوونی ئەمیرخانی برادۆست، خانی لەپ زێرین و هاوپەیمانان و دۆستانی ئەو سەردارە مەزنەی کوردە.

ئەو کارەساتە ئەوەندە خوێناوی و بەسام بووە، شاعەبباسی سەفەوی، شای خوێن رێژ و پیاوکوژی ئێران ئەوەندەی رق لە نەتەوەی کورد بووە، ئەوەندە زالمانەو زۆردارانە دەگەل ئەو نەتەوە بێ دەرەتانە جوولاوەتەوە، ئەوەندەی خراپە کردوە، ئەوەندەی خەلك کوشتوەو ولات خاپوور کردوەو ژن و مندال بە دیل بردوە، ئەمیرخانیش وا پیاوانە راپەریوەو ئازایانە وەدەست هاتووەو سەری بۆ شۆرنەکردۆتەوەو بەرگری کردوەو ئەوەندە مەردانە شەهیدکراوە، کە رابردنی زەمان نەیتوانیوە تۆزی فەرامۆشی لەسەر ئەم کارەساتە دابێژێ و لە پێش چاوانی ونبکا.

شایەر و خۆشخوانەکان ئەو کارەساتەیان بە شێوەی جۆربەجۆر کردۆتە بەیت. لك و پۆپیان لێ کردۆتەوەو شاخ و بالیان لێناوە. لە هەموویاندا دووشت لە پێش چاو گیراوە: ئازایەتی و خۆراگری ئەمیرخان و دلرەقی و بێ بەزەیی شاعەبباس. لەنێو ئەو بەیتانەی من لەوبارەدا بیستوومن، هیچیان ناگەنە ئەو بەیتەی کە زانای گەورەی ئالمانی (ئۆسکارمان) لە سەرەتای ئەم چەرخەدا لە رەحمان بەکری بیستوەو لە ١٩٠٥دا چاپی کردوەو ئێستا لەدەست دایە. لە هەموو بەیتێك دا خەیالاتی شاعیرانە بەسەر واقیعیاتی مێژوویی‌دا زال دەبێ. لەوبەیتەش دا ئەوە دەبینرێ ، بەلام وادیارە ئەو بەیتە زۆر لە پاش قەومانی کارەساتەکە نەگوترابێ. چونکە ناوی هێندێك کەس لە کاربەدەستانی قزلباش و لە دۆستانی ئەمیرخان لەو بەیتەدا وەك خۆیان ماونەوە. مێژوونووسەکانی خۆمانەو بێگانەش لەسەر ئەو کارەساتەیان نووسیوە. سەرچاوەی هەموویان (مێژووی عالەم ئارای عەبباسی) کتێبە بەنرخەکەی ئەسکەندەربەگی تورکمانە.

ئەسکەندەر بەگ هەرچەندە نۆکەرو نمەك خوردەی شاعەبباس و دژمن و نەتەوەی ئەمیرخان بووەو داوای رەوای ئەو سەردارە مەزنەی بە لاساری و سەرپێچیو تەنانەت نمەك بەحەرامی و لەرێ دەرچوون داناوەو بە ئاشکرایی جنێوی بە کوردان داوەو دەلێ: ((وەحشی ترین تیرەی ئینسانن))و کوشتاری ئەو گەلەی بە غەزا زانیوەو گوتوویەتی ((ئەرکی سەرشانی شای ئیسلام پەنایە ئاسەواریان لێ ببرێ)) بەلام پیاو هەق بلێ پیاوێکی زۆر خوێندەوارو زاناو مێژوونوسێکی یەکجار وردو وریا بووەو رووداوەکانی مێژوویی سەردەمی شاعەباسی زۆر بەسەرنجەوە تۆمارکردوون. جگە لەوە خۆی لە گەمارۆدانی قەلای دمدم دا بەشداربووەو ئاگای لە هەموو کەین و بەینێك بووە.

راستە ئەویش وەك هەموو دەستو پێوەندی شایان ریایی‌بازو درۆزن بووەو زۆری تەشی لەبەر شاعەبباسی رستوەو بە بەژن و بالای ئەو شا بەدفەرو خوێن رێژەی هەلگۆتوەو وای نیشان داوە کە تاوانی کوردان بووە کە دلی ناسکی خاوەن شکۆیان شکاندوەو هەقی خۆیان بووە قەتلوعام بکرێن و بەودەردە بچن، بەلام دەگەل ئەوانەشدا کتێبەکەی زۆری زانیاری تێدا هەیەو سەرچاوەیەکی بەکەلکە بۆ ئەو کەسانەی بیانەوێ لە بارەی قەلای دمدم و سالی موکری قرانەکەدا شت بنووسن.

کارەساتی دمدم و موکریان کە یەکێك لە بەسامترین رووداوەکانی مێژووی کوردستانە، هەستی نەتەوایەتی زانایانی کوردی جۆشاندوە. خانی ئەمر شاعیری مەزنی کورد ئەو هەستە ئاگرینەی چل و چەند سال پاش کارەساتەکە لە سەرەتای مەم‌وزین دا دەربریوە.

لەوسالانەی دوایی‌دا نووسەری مەزن‌و زانای بەناوبانگی کورد عارەبی شامۆ چیرۆکێکی درێژی بە ناوی قەلای دمدم بە ئوسلووبێکی نوێ و باوی رۆژ نووسیوە. نووسینی چیرۆکێکی مێژوویی لە مێژە لە ئەدەبیاتی گەلانی تردا جێی خۆی کردۆتەوە. بەلام ئەوە یەکەم چیرۆکی درێژە کە من بە زمانی کوردی لەوبارەدا خوێندوومەتەوە.

بەداخەوە من نووسینەکەی ئەوم نەخوێندۆتەوە. چونکە سەرم لە خەتی رووسی دەرناچێ و کتێبەکەش بە خەتی رووسی چاپ کراوە. بەلام مامۆستا شکور مستەفا کە ئەم چیرۆکەی هێناوەتە سەر شێوەی کوردی کرمانجی خواروو، دەلێ: ((دەستم لە ناوەرۆکی چیرۆکەکە نەداوەو هەر روالەتەکەم گۆریوە)).

مامۆستا عارەبی شامۆ بە خەیالی بەرزی هونەرمەندانەی خۆی چیرۆکێکی شیرین و پرکارەسات و هەست بزوێنی خولقاندوەو خزمەتێکی گەورەی بە ئەدەبی نەتەوەکەی کردوە. سەر تاسەری ئەم چیرۆکە بەتامە پرە لە هەستی پیرۆزی ئینسانی، نیشتمانپەروەری و گەل خۆشەویستی.

چیرۆکی قەلای دمدم نموونەی ئەدەبێکی ریئالیستی رەخنەگرانەیە لە ئەدەبی کوردیدا کە ئەگەر بێوێنە نەبێ کەم وێنەیە. لە لابەلای دێرەکانی ئەم چیرۆکەدا پەردە لەسەر واقیعی ژیانی کوردەواری هەلدراوەتەوەو رێ‌و شوێنی نەتەوایەتی نەتەوەی کورد بە لایەنی باش و خراپ دا نیشان دراوەو بۆ ئەو بێگانانەی کورد باش ناناسن زۆر بە کەلکە.

پاڵەوانەکانی ئەم چیرۆکە هیچ کامیان بۆ کوردێك نەناسیاو نین. شەباب لاوێکی کوردی ئاسایی و ڕەزا سووکە کە هەمو ڕۆژێ لە ڕێبازو کووچەو کۆڵانان دا تووشی دەبین و قسەی دەگەڵ دەکەین. دڵبەر کچە کوردێکی لەبارو نەشمیلانەیە کە لە هەموو گوندو شارۆکێکی کوردستاندا نموونەی زۆرەو هیچ وێ ناچێ خەیاڵی نووسەرێك خوڵقاندبێتی. زۆر هەمزە چاوەشمان دیون و دواندوون. زۆر وەستای ئەرمەنی و ئاسۆری ئامرازی پێویستیان بۆ دروست کردووین. زۆر ئەسکەندەری پیر چیرۆکی کۆنیان بۆ گێڕاوینەوە.

کەم لاوی کورد هەیە لە دڵداری‌دا شەبابێك نەبێ. کەم کیژی کورد هەیە بڕوای بە پڕوپووچ نەبوو بێ و پەنای بۆ پڕوپیرێژنان نەبردبێ و نوشتەی چەوروشیرینی و دەم بەسی بەمەلا نەکردبێ و چلدانەو شەمۆڵەی نەگرتبێتەوە.

بن پشك و خوشکی بچووکی وەك نەنێمان زۆر دیون کە دیاری و ڕاسپاردەی کاکیان بۆ دەزگیرانەکەی بردوە.

بەڕاستی مامۆستا شارەزایی تەواوی لە واقیعی ژیانی نەتەوەکەی هەیەو زانیاریەکەی خۆی زانایانەو وەستایانە لە لابەلای دێرەکانی ئەم چیرۆکە شیرینەدا گێڕاوەتەوە.

هەوارو بانەمەڕو ئاژەڵداری، هەرەوەزو دەستەواو، لەبەر شانە دانیشتن، خوری ڕستن، لێك کۆبوونەوەی کچان، تەون هەڵاوەسین و وێنەی مافوورە گرتنەوە، مازووچنین، ڕابواردن، داوەت و هەڵپەڕین، ژوان و دڵداری، جووت و گاو کشتوکاڵ و ئاشەوانی، نوێژو تاعەت، سواری و تەقڵەو ڕمبازی، ڕاووشکارو نێچیرەوانی، نانبدەیی و میوانداری، ژن زۆر هێنان و کچ فرۆشی و شیربایی وەرگرتن، نیشتمان پەروەری و فیداکاری و گیانبازی، خەیانەت و بێگانە پەرستی و ڕووڕەشی، هەموویان بە زمانێکی شیرین و ساکار لە جێی خۆیاندا لەم چیرۆکەدا باس کراون و نرخی چیرۆکەکەیان زیاتر کردوە. مامۆستا نە لە نیشاندانی کردارە باشەکاندا زێدەڕەوی کردوەو لە ڕاستی دووربۆتەوە، نە کردەوە دزێوو ناشرینەکانی شاردوونەوە. مامۆستا لە سەرتاسەری ئەو چیرۆکەدا تێکۆشاوە ئاکاری پاك و کرداری چاك لەنێو کۆمەڵی کوردەواری‌دا برەو پێبدا. دەیەوێ لاوانی کورد ڕاست و پاك و نیشتمان پەروەر بن و دۆست و دوژمنی خۆیان بناسن. دۆستیان خۆش بوێ و کۆمەگ و یارمەتی بدەن و باربووی لێ وەرگرن دوژمنیان ناخۆش بوی و ڕقیان لێبێو لەسەریەوە نەچن و فریوی نەخۆن. هەر بەوەندە ڕانەوەستاوەو ویستوویەتی ئوسوولی شەڕی پارتیزانی فێری شۆڕشگێرانی کورد بکاو تەنانەت ئەوەندەی لەوبارەدا دڵسۆزی نیشانداوە کە ناچاربووە جارجار لە واقیع دووربێتەوە. بۆ ئەوەی شۆڕشگێرانی کورد لە شەڕی شەوی‌دا فێری خۆشاردنەوە بکا، لە شەڕی شەمزینانندا ڕووداوێك دەخولقێنێ و هەمزە چاوەشی هێدی و هێمن و دڵسۆز کە نموونەی فەرماندەیەکی هەرەباش و لەسەرەخۆیە وا تووڕە دەکا کە ناچاربێ داگژێتە سەربازێك و لێی‌بدا، چونکە جگەرەی داگیرساندوە.

بێگومان مامۆستا لێرەدا هێند بەتەنگ فێرکردنەوە بووە زەمان و مەکانی لەبیرچۆتەوە. ڕاستە لە زەمانی شاعەبباس دا پێی ئورووپاییەکان بۆ ئێران کراوەتەوەو تەنانەت ئەو پادشایە برایانی ((شیرلی)) وەك ڕاوێژکەری سوپایی هێناونە ئێران و باڵیۆزی ناردونە ئوروپا، دوورنیە تووتن کە لە ئامریکاوە هاتۆتەوە ئوروپا گەیبێتە ئێرانیش، بەڵام تۆبڵێی لە کوردستاندا ئەو سەردەمی قەننەکێش هەبووبن؟ گریمان تووتنیش بووبێ و قەننەکێش هەبووبن، خۆ ڕەنگ بێ مامۆستاش وەك من لە بیری بێ تا ئەم دواییانە کورد بە بەردو ئەستێ ئاگریان هەڵدەکردو سەبیلەو قەننەیان دەکێشاو جگەرە هەر نەبوو. جگەرەکێشان و ئاگرهەڵکردن بۆ پارتیزان مەترسی هەیەو مامۆستای مەزن دەیەوێ ئەم ئەزموونە بەنرخەمان فێربکا بۆیە تووشی ئەو هەڵە بووە.

بەداخەوە ئەم چیرۆکە بەنرخە هێندێك هەڵەی وای تێدا هەن کە بە هیچ بارێك ناکرێ چاویان لێ بپۆشرێ.

چیرۆکی مێژوویی ئەسڵێکی هەیەو هەمووی زادەی خەیاڵی نووسەر نیە. بەڵام نووسەر شاخ و باڵی لێ دەنێ و لك و پۆپی لێ دەکاتەوە. لە چیرۆکە سەرکەوتوەکاندا هەمیشە ناوی قارەمانە نەناسراوەکان و شوێنی گرنگی جغرافیایی دەپارێزن. ئەوکەسەی چیرۆکێکی مێژوویی دەنووسێ دەبێ شارەزایی تەواوی لە مێژوو و جغرافیادا هەبێ تا بە هەڵە نەچێ، بۆ بەڵگە ئیشارە بە چیرۆکی ((شەڕو ئاشتی)) تۆلستۆی دەکەین. بێ گومان مامۆستا لەمن باشتر ئەم چیرۆکە دەزانێ، چونکە بە زمانی ڕوسی خوێندۆتەوە. ڕەنگبێ چیرۆکی ئەوەندە قارەمان زۆر کەم بن، بەڵام چونکە تۆلستۆی مەزن ئاگای لە مێژوو هەبووەو جوغرافیای وڵاتەکەی باش زانیوە، ساڵی قەومانی شەڕو ناوی قارەمانە دەرەجە یەکەکان و شوێنی شەڕگەکانی نەگۆڕیوەو پاراستوونی. خوێنەر قارەمانەکانی تریش بە قارەمانی خەیاڵی نازانێ و ڕووداوە پچووکەکانی نێو کارەساتەکە بە زادەی خەیاڵی نووسەر دانانێ.

جێی داخە مامۆستای خۆشەویستی ئێمە زۆر کەمی شارەزایی لە مێژوو و جغرافیای کوردستان و ئێران هەبووە. سەرانسەری چیرۆکەکەی لەسەر خەیاڵی خۆی داڕشتوە، بۆیە هەڵەی زۆر زەق و بەرچاوی لە نووسینەکەی‌دا هەیە.

کەسێك بیەوێ لەسەر قەڵای دمدم بنووسێ ناچارە، بزانێ پایتەختی شا عەبباس ئیسفەهان بووە نەك تاران. شاعەبباسێکی لە سەردەمی دەستەڵاتی ڕەش و زۆردارانەی خۆیدا زۆر شاری سووتاندن، زۆر قەڵای ڕووخاندن، زۆر وڵاتی خاپووركردن، ئیسفەهانی وا ڕازاندەوە، وا ئاوەدانکردەوە، کە پێیان گوت: (اصفهان نصف جیهان). ئێستاش ئەو خانووبەرەو مزگەوت و



باغانەی ئەو دروستی کردوون و بینای ناون جیهانگەڕان بۆ ئیسفەهان ڕادەکێشن.

مامۆستا پێش نووسینی چیرۆکەکەی مێژووی ئێرانی نەخوێندۆتەوە، تا بزانێ ئەو شاعەبباسەی ئەو باسی دەکا چ دێوەزمەیەکی خوێنخۆر بووە؟ ئەگەر بەپەلە چاوێکی هەر بە عالەم ئارای عەبباسیدا گێڕابا کە مێژوونووسی تایبەتی شاعەباس نووسیویەتی، دەیزانی ئەو زۆرداره پیاوکوژە نێرینەی لە مەڵبەندی موکریان، لە بەشێکی گەورەی نیشتمانەکەمان بڕیوەو مێیینەو وردەی بەدیل بردووە.

پێم وایە ئەگەر مامۆستا دیزانی ئەو شاعەباسە ئەوەندە زۆردار بووە کە نەتەنیا هەزاران کەسی کوشتوەو هەزاران وەجاخی کوژاندۆتەوە، بەڵکە خۆشی وەجاخ کوێر کردوەو لە سێ کوڕەکانی خۆی دووی چاو دەرێناون و یەکی سەربڕیوە، تابلۆیەکی زۆر بەسامترو ڕەش ترو ئینسانی تری لە شاعەبباس دەکێشا.

مامۆستا نەك زۆر ئاگای لە مێژووی ئێران نەبوە، بەڵکە گوێی نەداوەتەوە مێژوو و جغرافیای وڵاتەکەی خۆشی. دەنا هیچ نەبێ دەبوو بزانێ سلێمانی زۆر پاش کارەساتی قەڵای دمدم دروست کراوە. من بەش بەحاڵی خۆم ناوی عەشیرەتی بەرۆدارم نەبیستوە کە مامۆستا دەڵێ خانۆی لەپ زێڕین گەورەی وان بووە. بۆ ئەوەی بزانین ئەمیرخان کێ بووەو چۆن پێ گەیوە، ناچارین پەنا بەرین بۆ ئەو نووسراوەی دوژمن لەسەری نووسیوە، چونکە بۆخۆمان سەرچاوەی کۆنترمان نین، خاوەنی عالەم ئارا دەنووسێ:

((پاش نەمانی شای بەهەشتی کە ڕۆمییەکان مرخیان لە ئازەربایجان خۆشکرد، عێل و عەشیرەتە کوردەکانی سەر بەئەم دەوڵەتە بایانداوەو ڕەگەڵ ڕۆمییەکان کەوتن. شا موحەمەد ناوێك لە میرزادەکانی برادۆست بە فەرمانی خوندکاری ڕۆم کرا بە مەزن و خاوەن دەستەڵاتی برادۆست.

ئەمیرخان سەری بۆ دانەنواندو ملی بۆ ڕانەکێشا، هەردەمە ڕەگەڵ یەکێك لە ئەمیرە گەورەکانی کورد دەکەوت. ماوەیەك لەکن عومەربەگی حاکمی (سهران) ڕایبوارد. لە شەڕێکدا کە عومەربەگ

دەگەڵ دوژمنەکانی کردی، ئەمیرخان دەستێکی لە ئانیشکەوە پەڕی، ناوبانگی بە ئەمیرخانی چۆلاق(٢) ڕۆیشت.

لەو ساڵانەدا کە ئاڵای بەرزی پادشایی لە ئازەربایجان دەشەکاوەو شا بەو پێ و قەدەمە پیرۆزەوە بەرەو نەخچەوان و ئێرەوان دەیاژوا، ناوبراو هاتە بەردەرکی بارەگای پادشایەتی و خۆی بە شاپەرست و خزمەتکار نیشاندا. خاوەن شکۆ ئاوڕی ڕەحمەتی لێ داوە، مەزنایەتی و دەستەڵاتداری تەرگەوەڕو مەرگەوەڕی پێ بەخشی و نازناوی خانی دایەو سەری بەرز کردەوە. مەڵبەندی ورمێ و شنۆی کە سەر بە ئازەربایجانەو لە سەردەمی شای بەهەشتی‌دا لەژێر فەرمانی یەکێك لە گەورە گەورەکانی قزڵباشدا بوو پێ ئەسپارد. لە سەر فەرمانی شا، وەستا زێڕینگەرەکان دەستێکیان لە زێڕی سوور دروستکردو بە گەواهیرات و مرواری بەنرخ ڕازاندەوەو لە باسکیان بەست. چونکە ئازاو مەرد بوو خاوەنشکۆ زۆری ڕوودەدایەو گەلێکی چاکە دەگەڵ دەفەرموو. ئەویش دەستی خزمەتکاری لەسەر سینگ(٣) دانا. لە سایەی دڵسۆزی و چاوەدێری خاوەنشکۆدا ڕۆژ بەڕۆژ بە پەیژەی مەزنایەتی‌دا چوە سەرو لە هەموو هاوشانانی خۆی تێپەڕاند. چەند ناوچەو مەڵبەندی لە ئەمیرەکانی کوردی سەر بە ڕۆم ئەستاندەوەو لە نێو ئەمیرەکانی کورددا بە پایەبەرزی و لەشکرزۆری ناوبانگی دەرکرد. زۆر لە خێڵەکان لە ئەمیرزادەکان لە دەوری هاڵان و خزمەتی ئەویان ڕەچاوکرد. هێندەی پێ نەچوو هەواو فیز لەسەری‌داو لە خۆبایی بوو...

مێژوونووسێك کە ئەمیرخانی بەچاوی خۆی دیوەو سەرەڕای ئەو هەموو دوژمنایەتیە ئیعتراف بە ئازایەتی و مەردایەتی دەکاو دەڵێ: (ئەمیرخان لە عەشیرەتی برادۆست بووەو لەشەڕدا دەستێکی پەڕیوەو شاعەبباس دەستی زێڕی بۆ دروست کردووە)) بەڵام مامۆستا بە عەشیرەتی بەڕۆداری دەناسێنێ و دەڵێ: (چونکە زۆری زێڕ بەخشیوە پێیان گوتوە خانۆی چەنگ زێڕین)).

مامۆستا زۆر بە درێژی و وردی باسی قەڵای دمدم دەکا، بەڵام بەوحاڵەوە بە پێویستم زانی ئەو کورتە باسەی ئەسکەندەر بەگ لەسەری نووسیوە لێرەدا بێنمەوە کە دەڵێ: ((لە پێش ئیسلامدا لە زەمانی ساسانیەکان (اکاسرە)دا هەر لەو شوێنەدا قەڵایەك هەبوە کە پێی گوتراوە دمدم و دەستدرێژی ڕۆژگار خاپوری کردوە.

لە جێگایەکی دیکە نەخشەی قەڵاکەمان ئاوا بۆ دەکێشێ: ((ئەو قەڵایە لەسەر دوندی کێوێکی یەکجار بەرز دروست کراوە کە یەکپارچە بەردێکی درێژووکەو تەسکەو وەك پشتی گای هەڵکەوتوە. لای شیمال و جنووبی دۆڵی زۆر قوڵن کە لەژێرڕا بۆ سەرێ دەبێ بە پەیژەی خەیاڵ بۆی بچی. لەبەر بەرزی پێویستی بە

شوورە نیەو شوورەیان بۆ نەکێشاوە. دوولایەکەی دیکەی کە پانایی قەڵاکەن، لای ڕۆژهەڵاتی پاڵی وە پانایی چیا داوەو شوورەیەکی زۆر تەواوی بۆ کێشراوە بورجی بڵندی هەن و دەرگایەکی هەیە. لای ڕۆژئاوای کە لە گۆڕایی نزیکترە شوورەیەکی یەکجار قایمی هەیەو دەرگایەکی بەرەو جنووب دەکرێتەوە. لە دەروازە بۆ عەرزی ڕێگایەك بەنێو بەردیدا هەیە کە ئەوەندە تەنگە بەزەحمەت سوارێکی تێوە دەچێ. سەنگەر بردنەپێش لەلای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە نەبێ ناکرێ. لەلای ڕۆژهەڵات تیرهاوێژێکی بۆ دەرکی قەڵا بمێنێ، یەکپارچە بەردی سەخت و تەخت و ڕەقە. لە بنەوە بوودڕی بۆ لێ نادرێ. کە بەردەکە بڕاوە بورجێکی زۆر بەرزو قایمیان لێ دروستکردوە کە بۆ خۆی قەڵایچەیەکە. تا ئەو بورجە بەردەست نەکرێ سەنگەر بردنە بن قەڵا محاڵە. ئاوی قەڵا لە حەوزێکی گەورەڕا دابین دەکرێ کە بە باران پڕ دەبێ. بەڵام لەلای شیمال لەنێو گەلی‌دا نیزیکی قەڵا کانییەك هەیە. ئاوی زۆر کەمە، ئەمیرخان جۆگەی بۆ کێشاوەو ڕێی بۆ کردۆتەوەو دە حەوزەکەی کردوە. ئاوی ئەو کانییە لە ئێوارەوە تا بەرەبەیان حەوزەکەی پڕ دەکا. ئاوەکەی بەشی ڕۆژێکی قەڵانشینەکان دەکا. گومبەزێکیان لە ڕێی عەرزی لەسەر حەوزەکە هەڵخستووە کە لە پێش چاوان ونبێ، پێی دەڵێن (سوواق). بۆ پاراستنی حەوز خانەکە بورجێکیان بەپاڵ قەڵاکەوە هەڵچنیوە. لە لای جنووبەوە سەهۆڵدانێکیان سازکردوە کە لە زستاندا بە بەفر و سەهۆڵ داخندرێ. لە تەنیشت وی حەوزێك هەیە، تا ئەو بەفرو سەهۆڵەی لە گەرمای هاوین دا دەتوێتەوەو دەبێتە ئاو بەفیڕۆ نەڕواو لەوێدا کۆبێتەوەو لە کاتی کەم ئاوی‌دا بەکاربێ. ئەو سەهۆڵدانەش قەڵایچەیەکی لەسەر دروست کراوەو پاسەوان و تفەنگچی لەسەر داندراوە. بەویش دەڵێن (بوزلق) یا (قارلق)، ڕێگای ویش وەك ڕێگای (سوولق) لە دەرەوەڕا ونە.

بە کورتی ئەم قەڵایە لە پێنج قەڵا پێك هاتوە. یەکیان ئەسڵی قەڵاکە، یەکیان قەڵای خوارێ، یەك (سوولق) و یەك (بوزلق) و ئەوی دیکەیان بورجی گەورەی دەرەوەی دەرگای ڕۆژهەڵات، کە لە پێشدا باسمان کرد. هەر پێنج ئەوەندە بەرزو قایمن کە پەیکی تیژڕەوی بیرو مێروولەی خەیاڵ ڕێیان تێ ناباو وێیان هەڵناگەڕێ)).

پێم وایە ئەگەر مامۆستا هەرە ئەوەندەی ئەسکەندەر بەگ وەك دوژمنێك لەسەر قەڵای دمدم نووسیویەتی دەڕازاندەوە، چیرۆکە جوانەکەی دەگەیشتە ڕیزی شاکارەکانی بەرزی نووسەرە بەناوبانگەکانی جیهان.

لە عالەم ئارادا ناوی هەموو سەرکردەکانی قزڵباش و زۆر لە پاڵەوانانی کورد هاتوون. چەند خۆش بوو مامۆستا قارەمانی دەرەجەیەکی خەیاڵی نەخوڵخقاندبان و قارەمانە ئەسڵیەکانی ناوبردبان. جا کەیفی خۆی بوو بازرگانی عەرەبی ناودەنا ئیبنو بەتووتە یا نا. چونکە دەتوانین تەئویلێك بۆ ئەوە بهێنینەوە کە ئەو

---

(٢) وشەیەکی تورکییە، یانی گۆج.

(٣) ئۆسکارمان، تحفة ومظفرية، بەغدا، ١٩٧٥، ل٢٥-٢٧.

بازرگانە بە ناوی جیهانگەڕی بەناوبانگ کراوەو مەبەستی مامۆستا ئەو جیهانگەڕە نیە.

نامەوی باسی وەی بکەم کە وادیارە مامۆستا لە دوایی چیرۆکەکەیدا ماندووبووەو پشووی وەک پێشوو درێژو لەسەرەخۆ نیەو چارەنووسی بەشی زۆری پاڵەوانانەکانی نادیارە. چونکە ئەو شێوەم لە زۆر داستانەکانی ڕووسی بە تایبەتی شاکارەکانی تۆلستۆی مەزندا دیوەو مامۆستاش کەمو زۆر لە ژێر تاوی ئەواندایە. بەڵام دەوێرم بڵێم باسی گەمارۆدانی قەڵای دمدم و قەڵاداری ئەمیرخان و خۆڕاگری کوردان و بێبەزەیی دوژمنی کورت بڕیوەتەوە. چونکە بەشی هەرە گرنگی کارەساتەکە سەرنجی خۆمانەو بێگانەی ڕاکێشاوەو ناوی ئەمیرخانی لە مێژووی کوردستان دا بە نەمری هێشتۆتەوە ئەو بەشەیانە.

لەنێو کوردەواری باوە دەڵێن ژنی قەڵانشینەکان بەتایبەتی ژنەکانی ئەمیرخان لە قەڵاداریدا بەشداربوون و لە بەیتەکەشدا ئیشارەی بۆ کراوە وەک دەڵێ:

کێ بوو لە خاتوون پەروەرێ

کوتی: ((کاک ئاڵی ئەتۆ ماوی ئەتۆش هەڵێ))

هەروەها مەشهوورە دەڵێن ژنەکانی ئەمیرخان و گەورە گەورەکانی پاش گیرانی قەڵاو کوژرانی پیاوەکان خۆیان لە چیا هەڵداشتوە تا نەبنە دیلی دەستی دوژمنی بێ شەرم. لە بەیتەکەدا گوتراوە:

کێ بوو لە خاتوونی خانی

قبوڵ ناکەن کافرستانی؟

(خۆمان هەڵدەدێرین لەچل کەوانی)

مامۆستاش ویستوویەتی نەخشی ژنانی کورد لە خەباتی ڕزگاریخوازیدا بەرچاو نیشانبداو جوانیشی نیشانداوە. ئەویش زۆر جوان باسی ئەوەی کردەوە کە ژنەکان خۆیان کوشتوە. بۆیە داخم ناچێ نەیزانیوە یەکێک لە

ژنەکانی ئەمیرخان کە ئەسکەندەر بەگ نە تەنیا بێزی نایە ناوی بەرێ، بەڵکە قسەی سووکیشی پێ دەڵێ، شەش ساڵ پاش گیرانی قەڵا سەرلەنوێ قەڵا دەگرێتەوە. دڵنیام ئەگەر مامۆستا ئەوەی دەزانی چیرۆکەکەی دوو بەرگ دەبوو. چونکە ئازایەتی و فیداکاری ئەو ژنە کوردە بەشەرەفە خۆی بەرگێک چیرۆک هەڵدەگرێ.

مامۆستا باسی عەشیرەتی شکاک دەکا کە ئێستا لە دەوروبەری قەڵای دمدم دەژین، بەڵام لەو سەردەمیدا هیچ ناویان نیە. کەچی باسی عەشیرەتی گەورەو بەناوبانگی جەلالی ناکا کە بەداخەوە لەو سەردەمیدا تەنیا عەشیرەتێکی کورد بوون یارمەتی شاعەبباسیان داوەو بەشی زۆریان لەنێو قزڵباشدا بوون و ژمارەیەکی کەمیان لە سەنگەری شەرەفدا بەرگرییان کردووە.

مامۆستا بە ئەنقەست ویستوویەتی بڵێ شەڕی کوردان زیاتر بە تیرو شیر بووە. بەڵام لەڕاستیدا ئەمیرخان تۆپ و تفەنگیشی بوە. لە باری چەك و قۆرخانەوە تەنگاو نەبوە، هەر بێ ئاوی و تینوایەتی شپرزەی کردووە. وای لێ کردووە لە قەڵا بێتە دەرو شەهید بکرێ.

لە پێشدا گوتم من لە خوێندنەوەی خەتی ڕووسیدا کوڵم و چیرۆکەکەی مامۆستا عارەبی شامۆم نەخوێندۆتەوە. جا بۆیە ناتوانم لەسەر شێوەی نووسینی ئەو چ قسان بکەم. بەڵام ئەوەکەی مامۆستا شوکور مستەفام چەند جار خوێندۆتەوەو بە ڕاستی چێژم لێ وەرگرتووە.

عەیبی کار لەوەدایە ئێمە تا ئێستاش زمانێکی ستانداردمان نیە کە کەس نەتوانێ لێیلادا. هەروا بەهاسانیش ناتوانین ئەم زمانە پێك بێنین و خۆمان لە پاشاگەردانی ڕزگار بکەین. ماوەیەکە هێندێك لە نووسەرە زاناکانمان بە کردەوە بۆ ئەو کارە بەنرخە تێ دەکۆشن. دەوێرم بڵێم مامۆستا شکور یەکێك لە ئاڵاهەڵگرانی ئەم خەباتە پیرۆزەیەو لە ڕیزی پێشەوەدایە.

مامۆستا وەك پیاوێکی زاناو ڕاست دەستی لە تەعەسسوبی ناوچەگەری هەڵگرتوەو لە نووسینەکانی خۆیدا هەوڵدەدا لە هەموو شێوەیەکی زمانی کوردی کەڵك وەربگرێ و بە بڕوای من لەو کارە پڕسوودەشدا سەرکەوتوە.

مامۆستا تێ دەکۆشێ کام وشە ڕەسەن و سوك و ڕەوانەو کامکینایە لەسەر زاران خۆشە بەکاری بێنێ. لە بەکارهێنانی وشەی داتاشراوی نارەسەن و دزێو و ناشیرین خۆ دەپارێزێ. زۆر شارەزای ڕێزمانی کوردییەو لە ژێر تەئسیری زمانی بێگانەدا نانووسێ.

مامۆستا خوێندەوارو ڕووناکبیرە. زۆر گەڕاوەو گەلێکی خوێندۆتەوە. زەحمەت و کوێرەوەری کێشاوەو ئەزمونێکی تەواوی وەسەریەك ناوە. لەسایەی ئەو ئەزموونەدا گەیوەتە ئەم قەناعەتە کە هیچ شێوەیەکی زمانی کوردی با زۆریش دەوڵەمەند و پڕوشە بێ بەتەنێ ناتوانێ ببێ بە زمانی ئەدەبی نەتەوەکەمان. جا بۆیە ئەم ڕێبازەی گرتۆتە پێش کە لە پێك هێنانی زمانی ستانداردی کوردییدا بەشداری بکا. سەرەڕای ئەوانە هەرگیز وەك پیاوێکی لە خۆبایی لە نووسینەکانی خۆی دڵنیا نیەو بە شوورەیی نازانێ ڕاوێژی بە دۆستان و نیزیکانی خۆی بکا. ئەوەش ئاکارێکی باشەو پیاو دەگەیەنێتە ئامانجی خۆی. مامۆستا شوکور لە مێژە بە نووسەرێکی سەرکەوتوو ناسراوە. بەڵام بەبڕوای من لە نووسینی ئەم چیرۆکەدا خۆی گەیاندۆتە ترۆپکی هەرەبەرزی ئەدەبی کوردی. لە پێشدا گوتم ئەم چیرۆکە لەچاو ناوەرۆکەوە لە ئەدەبی کوردیدا ئەگەر بێوێنە نەبێ کەم وێنەیە. ئێستاش لە خۆم ڕادەبینم بڵێم لەچاو ڕواڵەت و فۆرمەشەوە هەر وایە.

سەرچاوە: پێشەکی هێمنی موکریانی بۆ چاپی کوردیی سۆرانیی ڕۆمانی قەڵای دمدم

# چەند بەشێك لە ڕۆمانی قەڵای دمدم

**پێشەکی نوسەر**

ئەو داستانە لە مێژووی ڕۆژانێك دەدوێ کە کوردستان لە حاڵێکی شڕو بارێکی یەکجار ناهەموار و دژواردا بوو..

لە لایەکی پادشای ڕۆمی کە بە زۆری چەك ئەرمەنستان و سوریاو مۆزەپۆتامیاو میسرو بولغارستان و ئارناوتستانی داگیرکردو پاشان بەو سوپاو چەك و جبەخانەی گەورەو گرانە بەسەر کوردستانیدا داو دەیویست خاکی کەوناراى باب و باپیرانی کوردانیش وەکو خاکی ئەو نەتەوانە داگیربکاو دەژێر باندووری خۆی باوێ.

لەلایەکی دیکەوە شای ئێرانێ لەشکر و قۆشەنی لەشەڕی سەدان ساڵدا قاڵ بۆوەی پەیتا پەیتا دەنارده سەر کوردستان داگیری بکا.

بەڵام نەتەوەی کورد بەوپەڕی مێرخاسی و گەڕناسییەوە بەرامبەر هەردووك دەوڵەتی گەورەو گرانی ئەو چەرخ و سەردەمە شەڕی دەکرد.

لەپاش گەلێك شەڕی گەورەو گران پادشای ئێرانی دیتیان بەجوێ جوێ هیچیان لەگەڵ ئەم خەڵکە قارەمانە پێ ناکرێ، ئەوەبوو کە لە ساڵی ١٦٣٩ز دا پەیمانێکیان بەست و کوردستانیان لەنێو خۆیاندا دابەشکرد، بەڵام ئەم سەرکوتکردن و بەشکردنەش بەکەڵکیان نەهات و هیچیان پێ نەکرا.

ئەم داستانە چیرۆکی شەڕی قەڵای دمدم دەگێڕێتەوەو ئەوە ڕووندەکاتەوە کە کورد بەرامبەر بە داگیرکەرانی کوردستان چۆن شەڕیان دەکردو خاکی باب و باپیرانیان چلۆن دەپارست، پێشەوای ئەم شەڕە، نە میر بوو، نە بەگ بوو، نە ئاغا بوو، کوردێك بوو نێوی خانۆ بوو، قەڵای دمدم ئەو بینای نابوو. خەڵکی پێیان دەگوت (خانۆی لەپ زێڕین).

خەڵکی کوردستان گەلێك بەیت و باوو داستان و چیرۆك و بەسەرهات لەبارەی ئەو شەڕە گەورەو گرانە دەگێڕنەوە...

دەربارەی شەڕی قەڵای دمدم و مێرخاسی کوردان گەلێك جیهان گەڕو ڕۆژهەڵات ناسی ئەورووپایی شتیان نووسیوە.

ئێمە لەو داستانەدا تەنیا نەخشەی ئەو شەڕانە دەکێشین کە نەتەوەی کورد چەرخاوچەرخ بۆ ڕزگاری وڵاتەکەی و نەتەوەکەی بەرپای کردووەو تا ئازاد نەبێ هەر شەڕدەکاو ناوەستێ.

## بەشی یەکەم

### بازاڕ

بەهار هەمیشە درەنگ دەگەیشتە ئێرە ، بەڵام ئەمساڵ بەفر هەر لەسەر چیا گەردنکەشەکان سپی دەچۆوە. بەهارەکەی قەڵای دمدم تازە پێڕۆکە ببوو. تەنیا ئەوانە مابوون کە زستانان با-دەپەناو پەسێوو چاڵە قووڵەکانی دەکردن، ئەوانەش تا گەرمای هاوین دادەهات نەدەچوونەوە.

لەو ڕۆژانەدا خەڵکی قەڵا خەریکی شۆم و تۆکردنی بەهارە بوون، هەندێ هەر لە ئاخپێنەکانی دەوروبەری ماڵاندا دەغڵ و دانیان دەچاند. ئەو بەیانییە پەڵە هەورێك لە سەرووی چیاکانەوە پەیدا بوو، ڕێژنە بارانێکی بەخوڕەم بەسەر قەڵای دمدمدا باریو تۆزو خۆڵی زەوی داپەستاوت و سەر لەنوێ خۆشیکردو بۆوە بە سامان. هەتاوە خۆشەکەی بەهارێ پەنجەی لە عەرزی گیرکرد. ئەم بارانە بۆن و بەرامەی هەوای پاك و خاوێن کردەوە. ئێمە لە کوردەواریدا بەم جۆرە بارانە دەڵێین: (گور گەزێ)...

ئاوی ڕوباری گەلی کە بە بن قەڵادا تێ دەپەڕی لەتاو ئەم گەرما بەتینەی بەهاری شێلوو و پڕ بە گەلی کەفی دەکردو، لەسەرڕا تیژ دەهاتە خوارێ، هەر گاشەبەردێکی دەکەوتە پێشی ڕای دەماڵی و بە خوڕ بەرەو خواری دەبرد. ئیدی قەت نەتدەگوت ئەمە ئەو ئاوە خۆش و خاوێنەی هاوینە کە لە کانییە دوورەدەستەکانەوە هەڵدەقوڵێ و بە بن قەڵادا تێ دەپەڕێ و دەبێتە ڕوبارێکی گەورەی پڕ لە ماسی ڕەنگاو ڕەنگ و بەهاژەهاژ دەڕوا.

لەو ڕۆژانەدا دارو درەختەکانی کووچەو کۆڵانی قەڵا لەبەر هەتاوی گەرمی بەتینی بەهار فراژوو ببوون و گەڵای سەوزیان لەبەر کردبوو، سێبەریان بۆ مرۆ خۆش دەکرد. دارقەیسی لە جێژنی گوڵاندا بوون. هەندێکیان بەر یان گۆپکەی کردبوو. لە نیوەڕوانێ بەدواوە، ئاو هێندە هەڵدەستا دەگەیشتە ئاشەکەی گەلی. (عەقدی) خاوەن ئاش هەموو ڕۆژێ بەرەبەیانێ زوو لە خەو هەڵدەستا لەگەڵ مەحمود مەرەکانی ئاشەوانی دەچوونە گەلی، شەو ترسیان نەبوو،



سارد بوو، بەفر نەدەتوایەوە، بەڵام ڕۆژانە گاشەبەردی زلیان دەدا پاڵ ئاشی، نەوەك شەپۆلی ئاو بیڕوخێنێ. خەڵکی قەڵا زۆر بەتەنگی ئەم ئاشەوە بوون. جگە لەمەش لەوەتی مەحموود مەڕەکانی ببووە ئاشەوان بەرداشی چاکتر بیراز دەکردو ئاردێکی وردو باشتری بۆ خەڵك دەهاڕی، ڕۆژێکیان بە فەرمانی خانۆ گەڵێ زەلام بە کۆمەکی عەڤدییەوە هاتن و ئاشەکەیان قایم و چەسپتر کرد. بەو هەوا خۆشە، لەوان ڕۆژاندا هەر لە سبیانێوە تا ئێوارێ قەڵا پڕ بوو لە خەڵك، هاتوچۆکەران سەرگەرمی سەوداو مامەڵە بوون، دوکانداران بانگیان دەکرد: (وەرن برا وەرن، وەرن کاکە وەرن،ماڵی چاك و هەرزان بکڕن)...

بازاڕی قەڵا پڕ بوو لە خەڵك: لە دەشتەکی و کۆچەر، لە ئازربایجانیو لە خەڵکی وانێ، لە خەڵکی وڵاتی ئاسۆریان و لە خەڵکی زۆر ناوچەی دیکەش. هێندێك شمەکیان هێنابوو دەیانفرۆشت. هێندێ هاتبوون شمەکیان دەکڕی و بۆ دەرێیان دەبرد. ئیدی بازاڕ جمەی دەهات. دیاربوو خەڵکی چیاکانی کوردستان لە سەرماو سۆڵەی زستانێ ڕزگاریان بوو، هەموو دڵخۆش و ئاسوودە بوون. کڕیاران دەستیان لەنێو دەستی دوکانداران دەناو پاش هەندێ دەستڕاتەکاندن لە نرخیان لە ماڵی فرۆتەنی دەنا، بەڵام دوکانداران لەو نرخەی گوتبوویان نەدەهاتنە خوارێ و پوولێکیان لێ نەدەشکاند ...

بازاڕی قەڵا قاوەخانەی خۆش خۆشی تێدا بوون. لەو ڕۆژە خۆشانەدا تەختیان لە ژێر سێبەری دارو درەختان دادەناو قاوەیان بۆ خەڵك دەگێڕا،ردێن سپی و پیرەمێردان دەهاتنە قاوەخانەکان و بەدەم قاوە فڕکردنەوە سەربهوردی ڕۆژگارانی ڕابردوویان دەگێڕاوە. پیرەمێردێکیان تێدابوو، کەمێ پشت کۆم، کوێرە برینێکی بەسەر برۆی چەپەوە بوو. هەر کە دەهاتە دوو، جارجار چاوی دەقوچاندن و هەڵی دێنان، کوێرە برینەکەی نیشانەی ئەوە بوو کە ئەم پیرە کۆنەساڵە بەرانبەر بە داگیرکەرانی خاکی کوردان زۆری ڕۆژگاری چەتوون و نالەبار دیون. ناوی ئەسکەندەر بوو، بەڵام پێیان دەگوت ئیسکۆ. پیرە فنجانێك قاوەی فڕکرد، ئەوجا چۆکی دادا، گوتی:

ئەو داستانەی بۆو دەگێڕمەوە لە مێژە ڕووی داوە، ئەودەمی هێشتا ساویلکە بووم، بەڵام لاوێکی کەتەی بەخۆوە بووم. بەری سمێڵم، وەك دەڵێن تازە خەتی دابوو. ساڵێکم لە نێو عەشیرەتی خالدیاندا بە خولامی ماڵە مراد بەگی بردبۆسەر، مراد بەگی ئاغام لەگەڵ عەشیرەتی مللادا دوژمن بوون. چەند ساڵ بوو بە سەرو گوێلاکی یەکیاندا دەداو هەمیشە شەڕمان بوو: پیاومان لێك دەکوشتن، یەکدیمان تاڵان و بڕۆ دەکرد. والی (دیاربەکرێ)ش قەتی درێغی لە کۆمەککردن و یارمەتیدانی بەگی عەشیرەتی مللا نەدەکرد.

دەیانگوت گۆیا چەکیشیان دەداتێ. جا والی چ دەربەست بوو بەتەنگی چییەوە دەهات، ئەو دەیگوت: ((خودای دەکرد کورد ئاسەواری یەکیان دەبڕییەوە، خێری ئێمە لەوەدایە.!) بەڵام عەشیرەتی مللا هیچ کاتێ دەڕۆستمان نەدەهاتن و هەر ئێمە ئەوانمان دەبەزاند. جارێکیان بڵاوبۆوە کە پادشای تورك، چەند

هەزار کەسێکی بەسەر کاری شوکری پاشای ناردووە، کوردستانی داگیرکا. ئەم خەبەرە گورجێ لەنێو کوردان بڵاوبۆوە، تەنانەت ئێمەش بیستمان. عەشیرەتەکانی سەر ڕێگای شوکری پاشای هەموو خۆیان کۆك و تەیار کردبوو کە ڕێگە لە دوژمنی داگیرکەر بگرن، بەڵام شوکری پاشا کاتێ گەیشتە گوندەکانی سەر ڕێگای، هەموویانی بەر تۆپان داو بەجارێ وێران و خاپوری کردن. ڕاستە بەینمان لەگەڵ عەشیرەتی مللادا خۆش نەبوو، بەڵام هەر کەبیستمان تورك بەسەر کورداندا دەدەن، ئەوانیش خۆیان کۆکردەوە لە داگیرکەران ڕاپەڕن و دەستدەنە چەکێ.

بەگی وان پەیکی خۆی ناردە کن مرادبەگی‌مە، گوتی:

-ئیتر ڕۆژی خیرەتە، با بەس والی دیاربەکرێ بەیەکماندا دا، پێویستە دەستی یەك بگرین و قران باوێینە دوژمن. هەواڵێکی دیکە بڵاوبۆوە کە گوایا شوکری پاشا گوندە کوردنشینە شەرنەکەرو بێ لایەنەکانی سەر ڕێگاش بە تۆپان دەداو منداڵ و پیرو پەککەوتەش دەکوژێو هەرچی کیژی جوان و ژنی لاویشە بەدیلیان دەگرێ. ڕۆژێکیان بەگی ئێمەو بەگی عەشیرەتی مللا تووشی یەك هاتن، هەرتکیان بە پێی ڕێو ڕەسمی باب و باپیران بەڵێنیان بەیەك دا بەگژ شوکری پاشادا بچن، نەهێڵن پێ باوێتە نیشتمانی ئێمە. بەرەی هەردوو عەشیرەتەکەش گەورەو بچووك بەڵێنەکەیان پەسەندکرد.

عەشیرەتی مللا لە دیاربەکرەوە نێزیك بوون، هەرچی ئێمە بووین تەواوێ دوور بووین. هەرکە پەیکی عەشیرەتی مللا پەیامی هێنا کە شوکری پاشا گەیشتۆتە سەر سنوورێ، ئیدی گورجێ بەهاواریانەوە چووین، بەڵام مراد بەگ خۆی لەگەڵماندا نەهات، زۆرۆ بەگی برا بچووکی لە جیاتی خۆی هەنارد. وێری و گەرناسی زۆرۆبەگ لەنێو کورداندا لەمێژبوو ناوبانگی دەرکردبوو. وەبیرم دێ، زۆرۆبەگ جارجار بەلاوی وەکو مەمانانی دەگوت:

((شەرکەر وێرای بوێریو مێرخاسی دەبێ لەشەڕدا فێڵو دەهۆو تەڵەکەش بزانێ، دەنا پیاو بە کەڵەمێردی ناتوانێ دوژمنی خۆی ژێرخا)).

من خۆم لەم شەڕەدا بووم، زۆرۆ بەگ لەپێشان چەند هێرشێکی توندو کوتوپڕی بردنەسەر، ئەوجا بە فێڵ کشاوە، کە گۆیا شکاوەو هەڵدێ. شوکری پاشاش بە لەشکری گەورەو گرانیەوە وە دوومان کەوت، بەڵام کە گەیشتە چیاکانی مە، ئێمە لەلایەکەوەو عەشیرەتی مللا لە لایەکی دیکەوە دامان پلۆستن، تا قڕمانکردن، داخی چەند ساڵەی دڵی خۆمانمان پێ ڕشتن، جا هەر لەو کاتەوە ئەمنیش کەوتمە نێو کۆمەڵێ سوارەی تورکەوەو لەگەڵیان بەشەڕهاتم، دووم لێ کوشتن، بەڵام یەکێ شیرێکی داوەشاند، سەرم بپەڕێنێ، منیش مەتاڵەکەم دایەبەری، شیر لە مەتاڵ ترازا، لە گوێم کەوت و پەڕاندی. منیش نەمکردە نامەردی گورج هاتمە دەست و شیرەکەم لە دڵیدا نوقم کرد، کوشتم و هەڵاتم. ئەو زەمانە زەمانی کەڵەمێردان بوو، نەك

گاڵتە، ئەو جۆرە کەڵەمێردانە کوان ئێستا؟! ئیدی شوکری پاشا بەرەودوا هەڵات، ڕۆیشت، بڕای بڕای نەگەڕاوە.

لەو ڕۆژە خۆشەدا خورشیدی بازاڕباشی سواری ئەسپەکەی ببوو و چەند یاساوڵێکی وەدووی خۆی دابوو، بازاڕو کوچەو کۆڵانی نێو قەڵای بەسەردەکردەوە. دوکانداران کە دیتیان، گوتیان: ((دەك بەخێر نەیێیت، ئاخۆ دیسان چ بڵێ؟!)) بازاڕ باشی فەرمانی بە هەموو دوکاندارو خاوەن خان و شوێنانی دیکەدا، گوتی:

ئەمن دوو ڕۆژ لەمەوپێش پێم نەگوتن: ((ئیتر بەهارەو گەرمە، دەبێ جۆگای پێش دوکان و خانەکانتان پاککەنەوە، یەعنی چی هەروەکو خۆیەتی؟ سبەینێ دەگەڕێمەوە خوام لەوخوایە پاك نەکرابنەوە. سا سوێندم بە چی یەکی سزایەکی گرانتان بدەم. پاشان نەڵێن لە خۆڕایی سزای داین. بازاڕباشی ئەم فەرمانەی بە دەنگێکی وا بەرز گوت خەڵکی گوزەرەکانی دیکەش گوێیان لێبێ. ئەنجا بەرەو کارگەکان ڕۆی. ئەم کارگانە بەرەو لای شوورەی قەڵاوە لە سەرووی بازاڕی بینانرابوون، ئەمانەش تەنیا جێگای کارگە نەبوون، بەڵکو وەستاژن و منداڵانیشیان تێدا دەژیان. هەریەك لەپێش کارگەی خۆیدا زنجێکی دروست کردبوو، دەگەڵ ماڵ و منداڵەکەی تێدا دەژیا. ئەم کارگانە وادروست کرابوون، ئەگەر پیاو بۆ بازاڕ هاتبا دەبوو بە بەردەمیاندا تێپەڕیبا. چونکە لە کارگەکان بەولاوە ئیدی شورەبوو پیاو نەیدەتوانی لە شوێنێکی دیکەوە ڕەت بێ. کارگەکان دوو ڕیزی ئەم بەرو ئەوبەر بوونو شەقامێکیان لەبەیندا بوو. لەبەر دەرگای هەموو کارگەیەکدا سەکۆیەکی تەختەدار هەبوو، هەر بەرهەمێك لەو کارگانە دروستدەکران، یا دەخرانە سەر ئەم سەکوانە یا بەداردا دەکران. جا چ لەو کارگانە دروست نەدەکرا؟! کارگە هەبوو، پاوەنی ئەسپ، نی گوێدرێژ و ئێستر و گای تێدا دروست دەکرا، کارگە هەبوو دەفرو ئامانی مس، سەتڵی گەورە، مەنجەڵ، تەشتی هەویر، کەوچك، سینی، لەنگەری، مسینەو لوولێنەو شتی دیکەیان تێدا دروست دەکران ودوایە بە قەڵایی سپی دەکرانەوەو دەبەر هەتاو دادەنران، چریسکە چریسك دەچریسکانەوە. کارگەی دی هەبوون چەکیان تێدا سازدەکردن: لە خەنجەر، لەشیر، لە مەتاڵی پۆڵا، لە سەرە نێزەی سێ پالوو، لە زرێ، لە سەرکۆمو کڵاوخوودو شتی دیکە. کارگەی واش هەبوون زینی نەخشراوی باڵکداری چاك و نەخشین و جوانی وای تێدا دروستدەکران ئەگەر سوار بۆ ڕێگای دووریش بچووباو مانگێکیش لەسەر ئەسپەکەی دانەبەزیبا وەڕەز نەدەبوو، هەروەها ئاوزەنگی، لغاوی ئەسپ، ڕەشمەی بەنەخش و نیگار، کۆپانی گوێدرێژ، نی هێستر و جل و جیازی وشتریشی تێدا دروست دەکران.

هەموو بەیانیەك تاریك و ڕوون، پێش ئەوەی شار لە خرپەی خەوی بەرەبەیان وەخەبەربێت، دووکەڵی کارگەکان بڵندەبۆوەو شاگردان پاش ئەوەی دەمەکانیان بە کورەکانەوە دەچەسپاند و بە ئاگری خەڵووز گەرمیاندەکردن، دەبوا ماوەیەکی زۆر بیاندەماندبان،

تا پارچە ئاسنەکان باش جۆشبخۆن ونەرم ببنەوەو بتوانرێ وەبەر چەکوش بدرێن و شمەکی فرۆتەنییان لێ دروست بکرێت.

لەبەر ئەوە هەموو کارگەکان لەپێش بازاڕ و دوکان و خانەکاندا دەکرانەوەو لە سبیانێ زوەوە ئیدی کار بێ وچان بە گەرمی دەستیپێدەکرد.

لە کارگە بچووکەکاندا هەردوو سێ کارگەر کاریان دەکرد، بەڵام کارگەی واش هەبوون، جگە لەوەستای خۆی، هەشت، نۆ، دە کارگەرو شاگرد کاریان تێدا دەکردن. پیاو کە دەینۆڕیە ڕەنگی کارگەکان دەموچاویان لە تەنی و هیسان ڕەش دەچۆوە، چونکە هەمیشە لەبەر ئاگرو دووکەڵ و تەنیدا بوون...

کەسانێك کە دەهاتنە نێو ئەم کارگانە هێشتا لە کار ڕانەهاتبوون، لەبەر تەق‌وهۆڕی چەکوشان و ئاورینگ و پریشکی ئاگر، کە بە چوار نکالاندا پەرت و بڵاودەبۆوە، وەڕەز دەبوون...

ئەم کارگانە بە زۆری ئی کوردی سلێمانی[1] و دیاربەکرو، شام و جێگاکانی دیکە بوون، بەڵام کارگەری عەرەب و ئەرمەنیشیان دەگەڵ بوون.

کاتێ خورشیدی بازارباشی گەراوە، دیتی لە نێو بازاڕ، هێشتا خۆڵەمێشێکی زۆر لە بەردەم کارگەکاندا کە لە زستانێرا هەر مابوون، کەڵەکەبوە. توورە بوو، دەستی بەقیژە-قیژێ کرد، گوتی:

-ئەمن چەند جارتان پێ بڵێم، گوزەرو بەردەمی کارگەکانتان پاك بکەنەوە؟ تا کەی لێتان بێ دەنگ بم...

بازاڕباشی هەڵیکوتایە سەر یەکیان‌و بەر قامچی‌یانی‌داو لە یاساوڵانی ڕاخوڕی: ((بیگرن، بۆ دیوخانێی بێنن))...

ڕاستە شاری قەڵای دمدم وەکو شارە کەوناراکانی سەردەمانی پێشوو هێند گەورەو فراوان نەبوو، بەڵام ئەمیش ببوو بە شارێکی زۆر چاك و چت خەیاڵ کردبا تێدا وەچەنگ دەکەوت. سەرەڕای هەندێ کەلەهەموو ناوچەکانی دەوروبەریەوە کڕیار و فرۆشیار ڕوویان تێ‌دەکرد، هەروەها لە وڵاتە دوور دەستەکانیشرا بازرگانی بۆ دەهاتن و کوتاڵی خۆیان دەکڕی و دەگەڕانەوە. لە شاردا گەلێ گوزەر و شارێ هەبوون، جگە لە دوو بازاڕ مەیدانێکی ئاژەڵیشی تێدابوو. لە مەیدانێکدا پەزو وڵسات‌و ئەسپ و ماینی کەحێلەی کوردەواری دەفرۆشران. خەڵك لە هەندەرانرا دەهاتن ئەسپی کەحێلەی کوردیان دەکڕی. کڕیاران کە لە بابەت و جۆرو ڕەسەنی ئەسپی کوردی دەدوان، دەیانگوت:

-ئەسپی کەحێلەی کوردی گوێیان کورت و مقەستییە، سمیان خشت و خڕە، سنگیان دەرپەڕیوو پانە، سەریان بچووکە، ئەستۆیان قەفە، باریك و زوران، ورگن و تەپ نین، پێت وایە کەم ئالیکن، بەڵام دەتوانن چەند ڕۆژ بەرگە بگرن، ڕێگای چەگلاوی و بەردەڵان و ڕەقەن، چیاو هەڵدێر، گەلی و کەندالێ، بۆ ئەسپی کەحێلەی کوردی وەکو یەکن، هیچ جۆرە گیانلەبەرێکی بەدەست‌و پی لەبەر بازیان ڕزگاری نابێ، هەتا کارمامزیش. فرە وشیار و زرنگن، تروك و سرکن، سواری خۆیان دەپارێزن... هەربۆیەش خەڵك لە هەموو چوار نکاڵی دنیاوە دێن و بەهەر نرخێك بی دەیانکڕن...

لەشار گەلێ دوکانی جۆراوجۆر هەبوون، لە دوکانی عەتارو وردەفرۆشان، متوموروو زەنگیانەو، دوگمەو کوژەکەو دەرزی ودەزوو، کشتەك و قەیتانی ڕەنگاو ڕەنگ و قۆچکەو مێنەکەو کڵاوو دەستەسرو توول و شاڵی ئاوریشم و کرمەك‌و تەقی گەردن و گەلێ شتی دیکە هەبوون. دوکانی کاڵاو قوماش فرۆشان هەبوون. جا کاڵاو قوماشی چ وڵاتێك لەم شارە نەبوو؟! ئەفغانستان و لە چۆغەی ئێرانت، لە قەدیفەی بەسرەت و لە چیتی فەرەنگت، ئەمانە گشت هەبوون. ڕیزێ لە کارگەکان ڕەنگ ڕێژ بوون، بەن و ڕێسمانی فەرش و قالیچەو مافوورو ڕایەخ و بەڕەو خورج و تێرو بوزەڵەو چارۆکەی کۆنی ئازووقەو دانەوێڵە فرۆشتنیش هەبوو: لەو دوکانانەدا گەنم و جۆ، گارس، گەنمەشامی، نۆك، نیسك و دانەوێڵەی دیکە دەفرۆشان.. لە شار گەلێ چێشتخانەی خۆش هەبوون: لە چێشتخانان لە سبحەینێرا تا ئێوارێ لەسەر ئاگری ڕەژی ئەوە هەر چێشتی جۆرجۆر بوو و لێ دەنران. پیاو کە بە پێش دەمی وان چێشتخانانداندا تێدەپەڕی بە بۆن و بەرامەی خۆش مەسا دەبوو و ئەگەر برسیشی نەبایە ئیشتیای دەچوو نێی: قاورمە، یاپراخ، قلیانی سەرسێڵ، تاسکەبابی، شیشکەباب، ڕشتەو ساوار، گۆشت و برینج، ناوساجی، شلکێنە، کەشکەك، پەلوولەو چێشتی دیکە ئەوانە هەموو هەبوون. چێشتخانان هەمیشە پربوون لە بازرگانان، دوکانداران، سەرەك عێل و خاوەن خان و کاروانچی و قەتارچییان کە بۆ ماڵ فرۆشتن هاتبوونە قەڵایێ. هی واش هەبوون خۆیان نەدەچوونە چێشتخانان، ئەوانە دەوڵەمەندی گەورەی شار بوون و خاوەن عەمباری پڕشمەکی تایبەتی بوون و ماڵیان بە تۆمەری دەکڕی و بە تۆمەریش دەیانفرۆشتەوە.

خاوەن چێشتخانان تاشت و فراوین و شیویان بە سەرکاراندا بۆ دەناردنە جێی خۆیان و جاروباریش خواردنیان بە تایبەتی بۆ ڕادەسپاردن و بەوجۆرە خواردنەیان دەگوت: ((خواردنی ڕاسپاردەو دڵخوان)) جگە لەوانە چێشتخانەی دەست کورتانیش هەبوون: سەروپێی بزن و مەڕو جوانەگا، وەکو دەڵێن وردە پزوورو پرزۆڵەو قاورمەی ڕێوی‌و سی‌و جگەر و پڵاوی هەرزن و سیراوو زۆر شتی دیکەیان تێدا دروست دەکردن. ئەوان چێشتخانان هەمیشە لە خەڵکی هەژارو لات ژاوەیان دەهات، هەندێکیان خێرو خۆشی شاری قەڵایان بیستبوو، لە هەندەرانرا هاتبوون، ئی واشیان تێدابوون لە ترسی خنکاندن و زوڵم و زۆری شای ئێران و پادشای ڕۆمی بە هەزار کولەمەرگی گەیشتبوونە وێ و ڕزگار ببوون. پیاوی زاناو خوێندەوارو وشیار تێگەشتووشیان دەنێودا هەبوون.

---

[1] سلێمانی ئەودەم نەبوو. تۆ بڵێی هۆزی سلێمانی مەبەست نەبێ؟

هەستەیە لای کورد، کە بەبۆچوونی شامیلۆڤ میرو سەرۆك هۆزەکانی کورد لەو سەردەمەوە واتا لەپێش (ئەحمەدی خانی)یەوە ئەو هەستەیان لاڕسکاوە هەوڵیانداوە بۆ ئەوەی قەوارەیەکی سەر بەخۆ بۆکورد دروستبکەن. کەئەمەش دیارە لەوێوە هاتووە کە هەر دوو داگیرکاری ئەودەمی خاکی کوردستان فارسە سەفەوییەکان و تورکە عوسمانییەکان بوون و خانی لەپ زێڕین یاخود وەك شامیلۆڤ دەڵێ(خانۆ)ی لەپ زێڕینیش وەك سەرۆك هۆزێکی کورد ویستوێتی وەك سەردارانی سەفەوی و عوسمانی مەملەکەتێك بەناوی کوردانەوە ئاوا کات و تەواوی سنورە جوگرافییەکەی لەدەستی زوڵمو جەوری سەفەوی و عوسمانی بپارێزێت.

تەوەرێکی تریان مەسەلەی خۆخۆری و یەکنەبوونی کوردانە کە هەر لەدێرەوە تائەمڕۆش گەورەترین فاکتەرو ڕێگرییەکە لەبەردەم دروستبوونی هەر جۆرە کیان و قەوارەیەکی سەربەخۆی کوردیدا، قسەکردن لەسەر ریشە مێژووییەکانی ئەو دەردە کوشندەیە لای شامیلۆڤ دادانی وانەیەکی مێژوویییە بۆ ئەوەی نوێی کورد لەسەردەمی تازەو سەدەی بیستدا سوودی لێوەرگرێت و بێبەش نەبێت، بەتایبەت ئەو وەختە سەرەتای دابەشکردن و داڕشتنەوەی نەخشەیەکی نوێ بووە بۆ جیهان بەگشتی و ناوچەکەی خۆشمان بەتایبەتی. شامیلۆڤ زیرەکانە ئەوەی پێکاوە کەوەك چۆن ململانێ و شەڕی دێرینی ئێمەی کورد بۆ سەربەخۆیی لەگەڵ دەسەڵاتی سەردەستی تورك و فارسدا بووە، لەسەر دەمی تازەشدا هەروا دەبێت و ئەو دەیەوێ بڵێت با ئەو گیانە خۆخۆرییە لەم سەردەمەدا زیندو نەبێتەوەو بگەینە سەربەخۆیی خۆمان.

تەوەرێکی تری قسەکردنی شامیلۆڤ لە رۆمانی قەڵای دمدمدا مەسەلەی ئایین و هەستی ئایینی بووە لەناو کورددا، چونکە کورد لەدوای فەتحی ناوچەکەی لەسەردەستی خەلیفەکانی ئیسلام ئیتر بەزۆر بێت یان بەخوایشتی خۆی ئایینی ئیسلامی وەرگرتووەو بەمەش گەورەترین زیانی بەرکەوتووە، چونکە ئایینی ئیسلام سوودی بەتەواوی ئەو نەتەوانە گەیاندووەو کە وەریانگرتووە بەڵام زەرەرێکی زۆری لەکورد داوە، لەمەسەلەی دروستکردنی هەر جۆرە کیان و قەوارەیەکی سەربەخۆدا. ئەمەش زیاتر لەو ڕووەوە باس دەکات کەهەر دوو ئیمپراتۆری عوسمانی و سەفەوی بۆ راکێشانی هەستی خەڵکی کورد ئایینیان وەك چەکێکی کوشندەو کاریگەر بەکارهێناوەو کوردیش نەیتوانیوە وەك ئەوان بەقازانجی نەتەوەکەی خۆی سوود لەئایین وەرگرێت و بیخاتە خزمەتی مەسەلە رەواکەی خۆیەوە، وەك چۆن تورك و فارس و دواتریش عەرەبەکان ئەوەیان کردووەو ئایینیان لەبەرژەوەندی نەتەوەو خاکەکەیان بەکارهێناوە.

لەلایەك فارسە سەفەوییەکان هەڵگری ئایینزای شیعەبون، چوون دەیانزانی ئایین بەگشتی قبوڵکەن دەبێت بچنە خزمەتی نەتەوەی عەرەبەوە، بەڵام هەڵبژاردنی ئایینزای شیعە بۆ ئەوەبوو ئایین بخەنە خزمەتی خۆیانەوە، دواتر تورکە عوسمانییەکان سوننە بوون و لەم ناوەشدا کورد هەر جارەی بەفیکەی لایەکیان فریوی خواردووەو



نەیتوانیوە وەك هەردوو لایان سوود لەئایین وەرگرێت. ئەوەتا تورك و فارسیش دوای نەمانی هەردوو ئیمپراتۆرییەتەکەیشیان دوو دەوڵەتی بەهێزیان لەناوچەکەو لەسەر خاکی ئێمەیش بنیاتناوەو وەك ئێمەیش پابەند نین بەئایینی ئیسلامەوەو قوربانیشیان لەو پێناوەدا نەداوە.

ئەم ڕۆمانە چیرۆکی ڕابونێکی تری کورد دەگێڕێتەوە لەمێژوودا کە یەکێك لەسەرۆك هۆزەکانی کورد بەناوی (خانۆی لەپ زێڕین) سەرۆك هۆزی (بەرۆدا) لەشا (عەباسی سەفەوی) فارس هەڵدەگەڕێتەوەو دەیەوێت ناوچەیەکی جوگرافی بۆ خۆی جیاکاتەوەو لەئێرانی دابڕێ و وەك شاعەباس ببێتە سەردارو دواتر شانشینێکی کوردی دروستکات. لەدوای دروستبوونی هەر دوو ئیمپراتۆریەتی سەفەوی و عوسمانییەوە کوردو خاکەکەی زیاتر داگیرکراو تالانکراو دەبن و ئەو دووەش لەژێر پەردەی ئایینی ئیسلامدا زوڵمو زۆرێکی بێسنوریان لەکورد کردووە، لێرەیشەوە هەمیشە کورد هەوڵیداوە لەچوارچێوەی ئەو دوو ئیمپراتۆرە ڕزگاری بێت و ببێتە سەرداری خۆی بەڵام وەك لەم ڕۆمانەشدا دەیبینین ئەم هەوڵانەی کورد هەمیشە دووچاری شکست بوونەتەوە ئەوەش وەك لەسەرەوە ئاماژەی پێدرا زیاتر پەیوەندی بە دووبەرەکی و خۆخۆری کوردەوە هەبووە، (مەحمود مەڕەکانی) نەیاری خانۆی لەپ زێڕینەو لەکۆتاییدا ئەو (کانی)یە بۆ (سەردارخان)ی سەر لەشکری شاعەباس ئاشکرا دەکات کە خەڵکی قەڵای دمدمی ژێر قەڵەمڕەوی خانۆی لەپ زێڕین ئاوی لێدەخۆنەوەو درێژە بەبەرگری خۆیاندەدەن دژی لەشکری سەردارخان، دواتر هەر بەو هۆیەوە قەڵاکە داگیر دەکرێت و بەر لەداگیرکردنیشی خەڵکەکەی ناوی لەتینوا دەخنکێن و قڕدەبن.

خاڵێکی زۆر گرنگی تر کەئەم ڕۆمانە ئاوڕی لێداوەتەوەو ئەوەیە کە کورد لەو سەردەمەشدا بیری لەوەکردۆتەوە سەر باری هەموو ناکۆکییە خێڵەکییەکانی خۆی پەنا بۆ یەکگرتن و هاوکاریکردنی یەکتر بەرێت، کوردەکانی ژێر دەسەڵاتی سوڵتانی عوسمانی لەناوچەی شەمزینان دەکەونە بەر پەلاماری لەشکری سوڵتان و ئەوانیش هانا بۆ خانۆی لەپ زێڕین دەبەن تا لەشکریان بۆ بنێرێت و دژی لەشکرەکەی سوڵتانی عوسمانی بجەنگن و بەرگری لەناوچەکانی شەمزینان و خاکی کوردستان بکەن، لەشکری خانۆی لەپ زێڕین بەرەو شەمزینان دەچێت و ئەو هێرشەی سوڵتانی عوسمانی بۆ سەر شەمزینان تێك دەشکێنن، دواتر لەوەش دەدوێت کە هەر دوو ئیمپراتۆری سەفەوی و عوسمانی سەرباری هەر جۆرە ناکۆکییەکی مەزهەبی و نەتەوەیی خۆیان، کەچی لەئاست هەر جوڵانەوەیەکی کورددا بۆ سەربەخۆیی یەکیان گرتووەو وازیان لە شەڕی نێوانیان هێناوە بۆ ئەوەی جوڵانەوەکانی کورد سەرکوت کەنەوە. ئەمەش تائێستا تاکە ستراتیژی ڕژێمە سەردەستەکانی تورك و فارس و عەرەبە بۆ ئەوەی کورد نەبێتە خاوەنی خۆی.

تەکنیکی ئەم ڕۆمانە هەر چەند زۆر سادەیەو زیاتر لەداستان و چیرۆکی گوێ ئاگردان دەچێت، بەڵام بۆ سەردەمی خۆی کارێکی زۆر داهێنەرانە بووە. شامیلۆڤ لەیەك کاتدا هاتووە مێژوو لەڕێگەی ڕۆمانێکەوە بگێڕێتەوەو دواتر لەڕێگەی ڕۆمانێکەوە مێژوویەك دروستکات هەم بۆ کوردو هەم بۆ ئەدەبی کوردیش. ئەمەش ڕەوایەو ناکرێت ئەم پیاوە وەك مێژوونوس ببینین و بەڕۆماننوسی نەدەینە قەڵەم، چونکە لەدنیاشدا زۆر ڕۆمان هەیە هەر بەو جۆرەی ئەو نوسراوەو سودی لەمێژوو وەرگرتووە، لێرەشەوە دەگەینەوە ئەوەی کە بڵێین: هەمیشە ڕۆمان دۆستایەتییەکی پتەوی لەگەڵ مێژوودا هەیەو هەر دووکیان بۆ ساغکردنەوەی کۆن و کەلەبەرەکانی مێژووی ئینسان سوود لەیەکتر وەردەگرن، بەڵام هێندە هەیە کە مێژوو کارێکی موجەڕەدی زانستییە بەتایبەت لەئێستادا وەك زانستی زانستەکانیش سەیر دەکرێت، بەڵام ڕۆمان ڕاستە ئاوی خۆی لەواقعی ژیانی ئینسان دەخواتەو لەڕابردووی ئینسانەوە دێت هاوشێوەی مێژوو سەرباری ئەوەش کارێکە پڕاو پڕ لەخەیاڵی ئینسان و بواری موبالەغەو زیاد پێوەنانیشی تێدایە جا لەهەر لایەنێکەوەبێت، کەئەمەش بۆ مێژوو نەشیاوە.

ئەم ڕۆمانە لەسەر ڕووداوێکی ناو مێژووی ئێمە وەستاوەو داستانی قەڵای دمدمی کردۆتە مەتنی سەرەکی گێڕانەوەکەی؛ کەدواجار بە خاپووربوونی قەڵاکەو تیاوونی هەموو خەڵکەکەی کۆتایی دێت، بەڵام وەك هەر ڕۆمانێکی تری دنیا ئاوڕی بۆ زۆر لایەنی تر داوەتەوەو تەنیا باسی شەڕو شۆڕی نەکردووە. ئەوەی من هەستم پێکرد لەم ڕۆمانەدا خەونی کوردە بۆ سەربەخۆبوونی وڵاتەکەیی و خۆ بەڕێوەبردنی، ئەم خەونە وەك لەم ڕۆمانە دا دەر دەکەوێت لەسەرەتای سەدەی شازدەوە لەسەری کورددایەو تائێستاش هەر نەهاتۆتەدی، هۆکاری ئەمەش هەندێکی لەم ڕۆمانەدا خراوەتە ڕوو ئەوی تریشی دەبێت خوێنەر خۆی بەشوێنیدا بگەڕێت.

دەکرێت لەکۆتاییدا لایەنێکی تری مێژوو کەمێك ڕۆشنایی بخرێتەسەر کە پەیوەندی بەداستانی قەڵای دمدمەوە هەیە، ئەویش دروستبوونی هەر دوو ئیمپراتۆری عوسمانی و سەفەوییە. (سوڵتان محەمەد فاتح)ی یەکەم لەساڵی (١٤٥١)دا بێزەنتەکانی لەقوستەنتینییە (ئەستانبول)ی ئێستا وەدەرناو بەردی بناغەی خەلافەتی عوسمانی سوونە مەزهەبی دانا، کە لەمێژودا بەئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بەناوبانگە. لەسەرەتاکانی ساڵی(١٥٠٠)تیش بەدواوە (شێخ ئیسماعیلی کوڕی جونێد)ی سەفەوی بەردی بناغەی ئیمپراتۆرییەتی سەفەوی شیعە مەزهەبی دامەزراند. کە خەونی کورد بۆ سەربەخۆیی لەقەڵای دمدمدا لەسەردەستی شاعەباسی سەفەوی لەبار براو تائێستاش هەر وەك خەوێك ماوەتەوە.

# فەرهەنگۆك

(ئـ)

ئاخوند: مەلای شیعە

ئاران: قشلاخ، دەشت

ئارمانج: ئامانج

ئاز: سەخت

ئاشپەزخانە: متبەق

ئامێر: ئەدات

ئاوزێم: ئاوبڕان

ئۆغرم: تەنگەتاو، ناخۆشی

ئولك: چەپەر

ئەرخایین: دڵنیا، بێباك

ئەستێور: وەجاخ کوێر

ئێرەیی: بەخیلی، حەسوودی

ئیکلام: تەمەنا

(ب)

بارانی کڵاوبەسەرە: بارانی دەنك گەورەو قایم

باڵیۆز: سەفیر

باندوور : نیلە

برۆ (تاڵان و برۆ): تاڵانکاری

بلووك: بەش

بن پشك: کچی بەمنداڵی بەشوودراو، دەستە خوشك، پێناوی نێوان دۆست و دڵدار

بنۆس: بنەما، بناغە

بەترەف: فرە زۆر، لەحەد بەدەر

بەدەو: بەڕاکردن

بەرك: قایم، ئاسێ

بەلەنگاز: هەژار

بەڵەد: دەلیل، شارەزا

بەوش: شتێکە وەك پانیکێش لەتەونکاریدا بەکار دەهێنرێ.

بۆکۆن: ناوساجی

بووزەڵە: پووزەوانە، زەنگاڵ.

بوودڕ: بندڕ، کوندڕ، کەندڕ

بیانی :بێگانە

بێخەوش: بێعەیب

بێگار: سوخرە

بێوان: جێگای جانەوەرو دڕندە

(پ)

پاپاخ: کڵاو

پاکاری: نۆکەری، خزمەتکاری

پرزۆڵە: پارچە بچکۆلە

پسپۆڕ: لێزان

پستە: چەرەز، شەوچەرە

پشتوو: دەمانچە

پۆڕ: قژ

پەنگر: پشکۆ

پەنی: پەنهان، پەنام، پەنامەکی

پەیا: پیادە

پەیك: قاسید

پێت: گڕ

پێحەسان: هەستیان پێکرد

پێڕۆ: نیزام

پێڕۆکە: تازە وەسەر پێکەوتوو

پێسیر: یەخە، بەرۆك

پێشخان: نۆکەریخان

پێکوڵە: درکێکە بنی ئەستورەو زۆر سەری هەیە

پێورمیزین: ئەستێرەکشان

(ت)

تاتك: پیتك

تاشت: نانی بەیانی

تانگ: تەنیشت، ئاست، تەك، هاوشان

ترووك: زۆر سلۆك، تۆڕ

تۆت: گلۆر

تۆمەری: بەسەرجەم، بەقەڵەم

تەرەوڵ: زیندەوەر، لاور

تەمۆری: کاکۆل، قژی چەپك کراو

تەوس: گاڵتە

تەوەزەل: بێکار

تەیار: ئامادە

(ج)

جگ : میچ

جمێ: جمڕانە ، جمکانە، دوانە

جۆرك: کیسە

جێژ: گەنم کەپاش درەو سوورکرابێ

(چ)

چاونەبەری: چاولەبەری، سەرشۆڕی

چلوان، چلوو: چلە

چوارنکال: چوارچمك، چواردەور

چووك: بچووك

چەتوون: سەخت، دژوار

(ح)

حەژمەت: تاو

(خ)

خاپاندان: خەڵەتاندن

خاپوور: وێران

خلندۆر: گیایەکە دەکرێت بە چێشت

خمام: تەمومژ

خوباب: غوباب، غەبغەبە

خورجینە: خورج

خۆزێ: خۆزگە، خۆزیا، بریا

خەرج: ضریبە

(د)

داخاوت: قسەی دەکرد

داغمە: مۆری دەوڵەتی

داڵقان: شۆڕبوونەوە

دانێغڵان: خپ بوون

دوێر: ژووری دانیشتن

دووئاژۆ: پاشەنگ

دەسبێنك: مورووی هۆنراوە کە وەك بازنە لەدەستدەکرێ

دەهۆ: فێڵ

دەبۆتخانە: دەبۆخانە، عەماری چەك، دەبۆ

دەرۆزەکەر: سواڵکەر

دەستدا: تابیع، پەیڕەو

دەستوو: دەسك

دەستەخۆ: دەستەوخۆ، دەستبەجێ

دەستەك: دەست نیشان کراو

دەسمز: ئوجرەت

دەفر: ئامان، حاجەت

دەلان: ئاولان

دەوار: وڵاخ

دەیاژوا: لێی دەخوڕی

(ر)

رادەموسم: ماچ دەکەم

ڕکێف: ئاوزەنگی، زەنگو

ڕەدووکەوتن: بەدووکەوتنی ژن

ڕەژی: خەڵووز

ڕەشۆڵە: ڕیشۆڵە

ڕەوکەوان: ئەوەی ڕەوە ئەسپ دەلەوەڕێنێ

ریحال: زین

ڕێ دەنیشت: لێ دەنیشت

(ز)

زبارە: دەسەوا

زنار: گابەرد/ قەدشاخ

زمێر: زەخیرە، زەخیرەخستن

زورار: قەدباریك

زەردەپەڕ: خۆر لە زەردە

(ژ)

ژاوە: جمە

(س)

ساپ: کا

ستێرك: شوقەلەت

سقدەر: عەتەبە، ئاستانە

سمکۆڵ: پێکۆڵی ئەسپ

سۆڵەخانە: سارداو

سۆنگە: هۆ، سەبارەت

سوورفل: سوورە

سەرەنگوێلك: زبڵدان، گووفەك

سەربهوورد: سەرگوزەشتە

سەرینچاوە: سەرچاوە

سەڵەف: سەرڕەو

(ش)

شارێ: شەقام

شتاقیان: کەسیان، هیچیان، چتاکیان

شتۆ: چۆن

شڤەڕێ: توولەڕێ

شۆم: زەوی شۆکردن، کێڵان

شوو: شووڕ، شووڵك، شووڵ

شەمۆڵە: شەمالە، دابێکی کوردەوارییە شەوانی شەموو بە مەبەستی زانینی ئەنجامی نیازێك جێبەجێی دەکەن.

شەوێن: شەوەکەژ

فراژوو: فراژی، هەڵدان

فزە: نقە

فەتارەت: خەسارەت

فەندباز: فێڵباز

فیڕۆ: خەسار

(ق)

قاسك: سەرەبزووتك، سووتەمەنی

قاڵیچە: مافووری چووك

قشلاخ: هەواری زستان

قلیانی: گۆشتی سورەوە کراو

قودەقوڕە: ترزل، بەفیز

قۆتك: گوڵەنگ

قۆشەن: لەشکر

قولله: برج

قەرا: ئەوەندە، قەدەر

قەرایی: قەدەر/ ئەندازە

قەرەواش: خزمەتچی

( ك )

کادە: جۆرە نانێکە

کرێت: دزێو، نەنگ

کونجرك: جۆرە دڕکێکە

کریڤ: هاوڕێ، دۆست، یارۆ

کۆسە میسری: جۆرە شیرێکی کۆنە لە میسر دروست دەکرا.

کوڵ: جل شتن لەسەرکانی

کۆڵۆس: کڵاو

کۆن: ڕەشماڵ

کەتە: قۆچاخ، بەخۆوە

کەرمۆز: مێشەکەرانە

کەژوو: کژك، گوریسی شۆرتکی

کەڤ: بەرایی، بەردەم

کەور: گاشە بەرد

کەوی: گزنگ

کێشکچی: ئێشکچی، پاسەوان

گیلەر: گەنجینە

( گ )

گاز: بانگ

گازن: شکایەت

گاڕام: داری کە گاو گۆتاڵی پێ لێ دەخوڕن.

گاڕس: جۆرە دانەوێڵەیەکە

گاشە بەرد: گا بەرد

گاو گەردوون: حەیوان سەربڕین بۆ قوربانی، گوری.

گدیۆ: هەتیو (واتە: کوڕە)

گر: کرد، خڕ، ڕاگر

گراو: دەزگیران

گرۆڤەر: خڕ

گورێخ: دڕ، نەهێن گر

گوژم: بڵندایی

گۆڤەند: شایی

گووفەك: زبڵدان

گەرمژ: گەرمیان، گەرمەسێر

گەڕناس: ئازا و دلێر

گەوگەو: گەگە، قەف قەف

( ل )

لاقرتی: قسەو قسەلۆك

لاکان: ئامێری بەسەر بەفردا خلیسکان.

لاوۆ: کوڕۆ، ئەی لاو

لوا: کەوڵی بەرخی بچووکی تازە سەربڕاو بە بەرگنەکەیەوە

لۆرك: چۆڕاوگەی پاش پەنیر دروستکردن

لۆزەنگەر، لۆزەندەر: زرتەزەلام

لەچەمبەرخستن: چواردەور گرتن

لەز: خێرایی

لێرەوار: جەنگەڵستان

( م )

ماهی: شفرە فیل، عاج

متەق: ورتە

مەتاڵ، مەرتاڵ: قەڵغان

مەڵاس: مات

مەمانان: ئێمەمانان

میچێن: جگێن، قاپێن، یارییەکی منداڵانە بە میچ

مێمڵ: ملۆزم

( ن )

نژیارکردن: ئاهەنگ گێران و قوربانیکردن بەبۆنەی دەستپێکردنی کارێك یا لێ بوونەوەیەوە.

نکال: کەنار، قەراخ

نۆغرۆ: وێران

نووسنەك: بەری دڕکێك دەنووسێ بە خورییەوە

نەجاخ: چەکێکە وەکو تەورزێن

نەزرگە: شوێنی یادی پیاوچاکێکی پێوەبێ. شەخس. قسن

نەواڵ: دۆڵ و دەرە

نەیار: دوژمن

نەینك: ئاوێنە

( و )

وربە: قاپووت

وشت: دەی، تێخوڕینی سەگ

وڵسات: بەرزە ولاخ

وەشێرم: بشارمەوە

وەدووتان بێنین: بە قسەتان بهێنین

وەلەرزین: ڕاکشان

وێستا: ئێستا

وێی نەدەدان: پێی نەدەدان

( ھ )

هامێز: باوەش، هەمبێز

هاوێرکردن: مەڕ جوێ کردنەوە بۆ دۆشین

هۆز: عەشیرەت

هۆڵێن: یارییەکی وەك گۆو چەوگانە هەرزەکاران و گەورەپیاوان دەیکەن.

هەراو: بەرین

هەرەوەز: دەسەوا

هەڵدێر: شوێنی زۆر بەرز، هەزار بەهەزار

هەندەران: دەرەوە

هەنیە: نێوچاوان

هەویا: هیوا، تەما

هەوێردە: کەڕەواڵە (باڵندە)

هیس: دۆرنج، تەنی

هێسا: حەساوە

هێسی: ملە

هێوران: دامەزران، قۆناخ گرتن

( ی )

یەغباڵ: تالع، بەخت

# یەکەمین ئەلف و بێی لاتینیی تەواوی زمانی کوردی

ن: د. جەودەت هوشیار
و: سەلاحەدین عوسمان

**١-دەستپێك**

سەرجەمی لێکۆڵینەوە تازەکانی بواری زانستی زمان، ئاماژە بەوە دەدەن کەزمانی وتن و بیستراوی باوی ژیانی ڕۆژانەی هەر کۆمەڵگایەکی مرۆڤایەتی تائەم یان ئەو ئاست لەنووسین بەهەمان زمان جیاوازە، لەبەرئەوەی وتنی دەمی و زیندوو دیاردەیەکی دەنگییە، بەڵام نووسین هۆکارێکی نزیکی هاوشێوەی دەربڕینی وردی ئەو دیاردەیەیە. گومانیش لەوەدا نییە کەزمانی گۆتن زۆر لەنووسین کۆنترە، بەشێوەیەك مرۆڤ بەر لەهەزاران ساڵ زمانی گۆتنی بەکارهێناوە، پێش ئەوەی بتوانێت یەکەمین شێوە لەشێوەکانی نووسین دابهێنێت، کە بەکارهێنانی وێنەبوو لەجیاتی وشە بۆ دەربڕین، پاشان بڕگەو پەرەگراف، لەکۆتاییشدا ئەلف و بێ، کە لەوانەیە پاڵنەری سەرەکیی تۆمارکردنیش دەربڕین لەخود وپێویستییەکانی تری دین و دەوڵەت بووبێت.

دەوترێت زمانی تۆمارکردنیش لەئەنجامی گەشەو پێشکەوتنی کۆمەڵگاوە نەشونما دەکات، زمانی کوردیش لەلایەن زمانە دراوسێکانییەوە ڕووبەڕووی چەندین شەپۆلی زمانی دژ بووەتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توانیویەتی پارێزگاریی لەبوون و سەربەخۆیی خۆی بکات، بیروڕای زاناکانی زمانیش دەربارەی سەرەتای نووسینی زمانی کوردی جیاوازییان هەیەو یەکدەنگ نین، بەشێوەیەك هەندێك لەوان وای بۆدەچن و لەو بڕوایەدان (ئاڤێستا) کەکتێبی پیرۆزی ئایینی زەردەشتییەکانە، لەسەدەی شەشەمی پێش زایینیدا بەزمانی میدیایی تۆمارکراوەو نووسراوەتەوە، زمانی کوردییش لەوەی دواییەوە هەڵقوڵاوە، بەواتا کۆنترین شێوەی نووسین بەزمانی کوردیی بۆ ئەو مێژووە دەگەڕێتەوە.

لەلایەن ژمارەیەکی زۆر لەنووسەرانی کوردیشەوە هەوڵی سەلماندنی بوونی ئەلفوبێیەکی کوردیی دراوە، کە یەك لەو نووسەرانەش خوالێخۆشبوو (گیوی موکریانی) بوو کە لەسەرەتای شەستەکاندا شێوە ئەلفوبێیەکی بڵاوکردەوەو لەو بارەیەوە وا رادەگەیەندرا کەئەوە ئەلفوبێیەکی کۆنەو مێژووەکەی بۆ ساڵی (٢٨٠٠)پ.ز دەگەڕێتەوەو تائێستاش لەو جۆرە هەوڵانە هەر بەردەوامن.

بەم دواییەش نووسەری کوردی بەناوبانگ (محەمەدی مەلا کەریم) شێوە ئەلفوبێیەکی کۆنی بڵاوکردەوە کە لەکتێبی (شوق المستهام في معرفة رموز الأقلام)ـی کوڕی وەحشییەی نەبەتیی کلدانی-(٢٤١ھ)یەوە وەریگرتبوو، کوڕی وەحشییە لەبەرامبەر هەریەك لەو پیتانەی لەئەلفوبێیەکەدا هەبوون ئەو پیتانەی تۆمارکردبوو کە لەئەلفوبێی عەرەبیدا بەرامبەریەتی، بەڵام پاش ئەوەی تێبینیمان کرد، لەو ئەلفوبێیەدا کەگوایا کوردییە، دەبینین پیتەکانی (ذ، ض، ط، ظ) هەبوون کەئەوانەش لەبەرامبەر چەند دەنگێکی زمانی عەرەبیدا بەکاردێن، کە لەزمانی کوردیدا نین، ئەو ئەلفوبێیەش کە لەکتێبی ناوبراودا هاتووە، دەنگەکان یاخود (پیت)ەکانی (ژ)، (ك)، (ڕ)، (ڵ)، (ۆ)، (وو)ی تێدا نییە.

هەرچۆنێك بێت رای زۆرینە کۆکن لەسەر ئەوە کەسەرەتاکانی نووسین بەزمانی کوردی لەنووسینەکانی (باباتاهیری هەمەدانی/٩٣٥-١٠١٠) دا خۆی دەنوێنێت، دوا بەدوای ئەویش چەندین شاعیری تری کوردی لەنووسیندا چاویان لێی کردووەو بەزمانە نەتەوەییەکەیان نووسیویانە، دیارترینیشیان (عەلی حەریری) و (فەقێی تەیران) و (مەلای جەزیری) بوون تا دەگاتە شاعیری نەمری کورد (ئەحمەدی خانی) و پاشان (نالی) و (حاجی قادری کۆیی) دێن، کە لەشیعرەکانیاندا ڕەسەنایەتی و دەوڵەمەندیی زمانی کوردیی تێدا ڕەنگیداوەتەوە.

تێبینی دەکرێت پێش هەموو کەس شاعیرە کوردەکان یەکەم کەس بوون بەزمانی دایك تەعبیریان لەئەندێشەکانی خودی خۆیان کردووەو خواست و ئارەزووەکانی میللەتەکەیان خستووەتەڕوو. ئەوەشی دەڵێت گوایا نووسینی کوردیی درەنگانێك و بەم دواییانە دەرکەوتووە، لەوانەیە نەزانێت یاخود ورد تر بڵێین: درکی بەوە نەکردووە کەنووسین بەزمانی کوردی لەخاڵی سفرەوە دەستی پێ نەکردووە، بەڵکو بەچامە شیعرییە جوانەکان و بەزمانێکی پێشکەوتوو دەستپێکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا نووسینی ئەدەبی پێش هاوشێوەکانی خۆی لەزمانە هیندۆ-ئەورووپاییەکان کەوتووە، کەکۆمەڵە زمانێکن زمانی کوردی سەر بەوانە.

بۆ نموونەو بەشێوەیکی گشتی دەبینین سەرەتای سەرهەڵدانی ئەدەبی روسی لەسەدەی دوانزەدا دەرکەوت، کەبریتیبوو لەچەند پارچە پەخشانێکی ساکار لەشێوەو ناوەڕۆکدا، کە بەزمانێکی روسیی کۆن نووسراوە، کەواپێویستدەکات وەربگێڕدرێنە سەر زمانە روسییە هاوچەرخەکە، تا خوێنەرانی ئەمڕۆی روسی

تێبگەن. سەبارەت بەزمانە سلاڤییەکانی ترو زۆربەی زمانە ئەوروپاییەکانیش، دەبینین جیاوازیی ئەوتۆی نییە. لەکاتێکدا چامە شیعرییەکانی بابا تاهیری هەمەدانی، هەموو خوێنەرێکی رۆشنبیری کورد تێیدەگات، لەگەڵ ئەوەشدا کەهەزار ساڵ بەسەر نووسینیدا تێپەڕیوە.

راستییەکەی ئەوەیە کەئەوەی دەرکەوتنی دواکەوتووە، ئەوەیە کەئێمە بەئەلفوبێ ناویدەبەین، نەوەك خودی نووسین بەزمانی کوردی.

**٢-گەشەکردنی ئەلفوبێی کوردی**

هەر لەو کاتەوەی شاعیرە کوردەکان، بەزمانی نەتەوەکەیان، بۆ چەندین سەدە بەو ئەلفوبێیەی پشتی بەپیتە عەرەبییەکان دەبەست و بەڕێنووسی زمانی فارسی بوو دەستیانکردووە بەنووسین، بەشێوەیەك زۆرینەی کولتووری کورد (هەر لەشیعرو پەخشان و دانراوە مێژوویی وئاییینی و ئەتنۆگرافی و زمانەوانییەکانیش) بەو ئەلفوبێیە نووسراون. ئەوەش هەر لەو کاتەوەی پرۆسەی تۆمارکردن لای کورد دەستیپێکردووە تا بیستەکانی سەدەی بیستیش بەهەمان ئەلفوبێ بووە، تەنانەت یەکەمین رۆژنامەی (کوردستان)یش کە لەقاهیرە دەردەچوو، بەو ئەلفوبێیە دەنووسراو دەردەچوو و بڵاودەکرایەوە، لەگەڵ زیادکردنی پیتی (ڤ) کە لەعەرەبی و فارسیدا نییە.

ئەو چاکەیەش لەگەشەپێدان و پێشخستنی ئەو ئەلفوبێیەدا بۆ ئەدیبان و زانایانی کورد دەگەڕێتەوە کە(تۆفیق وەهبی بەگ/١٨٩١-١٩٨٤) یەکێکە لەو پێشەنگانەی کەبێوچان و بەدرێژایی بیستەکانی سەدەی رابردوو لەهەوڵ و کۆششدا بوو بۆ چەسپاندنی دەنگە کوردییەکان و دانانی ئاماژەو نیشانە تایبەتەکانی ئەو دەنگانە، کەئەلفوبێی عەرەبی لەو بارەیەوە هەژارە، لەگەڵ ئەوەشدا کەتۆفیق وەهبی (وەك پێدەچێت) بۆی نەلوا ئامرازە تایبەتەکان لەڕێکخستنی دەنگەکاندا بەپێی دەرچوونیان لەزار بەکاربهێنێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دەرئەنجامانەی ئەو پێی گەیشت، تاڕاددەیەکی زۆر لەگەڵ توێژینەوە زانستییەکانی دواییدا سەبارەت بەچەسپاندن و رێکخستنی دەنگەکان یەکیگرتەوە، هەروەك ژمارەی پیتەکانیش بەشێوەیەکە لەهەردوو حاڵەتەکەدا (چ دەنگ و چ نووسین-وەرگێڕ) لەیەکدەچێت و ئەو ئەلفوبێیە باوەی ئەمڕۆش لەکوردستانی باشوورو رۆژهەڵاتدا بەکاردێت، لەگەڵ بوونی ناڕەحەتی و قورسییەکی زۆر لەڕووی رێنووس و ئیملاوە، بەچارەسەری کۆتایی نەگەیشتووەو تائێستاش هەوڵەکان لەو بارەیەوە هەر بەردەوامن.

بەڵام ئەو بەشە بچووکەی گەلی کورد کە لەپەراوێزی سنووری کوردستانی باکووری رۆژهەڵاتدا دەژیان، لەسەدەکانی رابردووەوەو بەدرێژایی ئەو سێ سەدەیەی دوایی، بەهۆی کۆچکردنەوە لەپارچەکانی تری کوردستانەوە، بەتایبەت لەکوردستانی تورکیادا بەردەوام لەزیادبووندابوون، ئەو دەستەبژێرە رۆشنبیرەش (کە لەسایەی سیستمی سۆسیالیستیدا نەشونماو گەشەیانکردو پێشکەوتن) سەرگوزەشتەو باسێکی دوورودرێژیان لەگەڵ ئەلفوبێی کوردیدا هەیە.

گومانیش لەوەدا نییە کەگرنگیی شوێنی ستراتیژیی کوردستان لەهەردوو بواری سەربازی و سیاسیی و هەڵکەوتنییەوە لەنزیك سنوورەکانی ئیمپراتۆرییەتی روسییەوە، پاڵی بەڕژێمی قەیسەرییەوە نا تا گرنگیی بەکوردستان وگەلەکەی بدات، هەر بۆ ئەو مەبەستەش ئەکادیمیای زانستی و پەیمانگای رۆژهەڵاتناسیی روسی لەو بوارەدا دەورێکی باڵاو بێ وێنەیان بینی، بەتێپەڕبوونی کاتیش کتێبخانەکانی روسیا بەکتێب و دەستنووس و لێکۆڵینەوەو توێژینەوەو راپۆرت سەبارەت بەگەلی کوردو نیشتمانەکەی ئاخنرا، بەشێوەیەك کەئەو گرنگیپێدانەش بەدرێژایی سەردەمی سۆڤێتی لەنێوان هەڵکشان و داکشاندا بوو، تا ئەو کاتەی شۆڕشی (١٤)ی تەممووز هەڵگیرسا، کاتێك لێکۆڵینەوە کوردییەکان لەیەکێتیی سۆڤێت (پێشوو) بووژانەوەیەکی گەورەی بەخۆیەوە بینی کەپێشتر لەنموونەی نەبوو، ئامارەکانیش ئاماژەدەدەن بەوەی کەسەرجەمی (لێکۆڵینەوە کوردییەکان)-مەبەست لەلێکۆڵینەوەکانیش لێرەدا بەشێوەیەکی مەجازی سەرجەم ئەو بڵاوکراوانە دەگرێتەوە لەسەر کورد نووسراون، هەر لەوتارو توێژینەوەو کتێب و ..هتد کە لەسەرجەم وڵاتە جیاوازەکاندا بڵاوکراونەتەوە، لەوانەش عیراق و ئێران و سوریا، کەتاساڵی (١٩٦٣) (کەساڵی دەرچوونی بیبلۆگرافیای بەرفراوانی لێکۆڵینەوە کوردییەکانە) سەرجەمی بڵاوکراوەکان گەیشتنە (٢٦٩٠) بەرهەم، کە بەشی روسیای قەیسەری، هەروەها یەکێتیی سۆڤێت لەو لێکۆڵینەوانە (١٦٣٤) بەرهەم بوون، واتا نزیکەی سێیەکی سەرجەم ئەو بابەتانەی لەگشت جیهاندا لەسەر کورد نووسراون[١]. لەبەرئەوە یەکەمین هەوڵ بۆ هێنانەکایەی ئەلفوبێیەکی تایبەت بەزمانی کوردی، لەئەرمینیا هاتەکایەوە-کەپێشتر سەر بەڕوسیای قەیسەری بوو و لەودیو چیاکانی قەفقاسەوە گەورەترین کۆمەڵی کوردیی تێدا دەژیا-بەبەکارهێنانی پیتە ئەرمەنییەکان، کەئەوەش لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا بوو.

بەڵام لەبەر جیاوازیی نێوان دەنگە کوردییەکان و دەنگە ئەرمەنییەکان، ئەو ئەلفوبێیە لەناوچوو و سەرینەگرت، بەشێوەیەك رۆژهەڵاتناسی دەرکەوتووی روسی (پیۆتەر لیرخ)-کە بەیەکێك لەدامەزرێنەرانی کوردۆلۆژیا دادەنرێت لەڕوسیادا- درکی بەوە کردبوو[٢]، هەربۆیە هەستا بەدانانی ئەلفوبێیەکی لاتینی بۆ زمانی کوردی، بەڵام هەوڵەکەی سەرینەگرت و سەرنەکەوت، ئەوەش لەبەرئەوە نەبوو کەکەسێکی بیانی بوو و رێکخستن و چەسپاندنی دەنگە کوردییەکان بۆ کەسێکی وەك ئەو گرانبوو، بەڵکو لەبەر ئەوەبوو کەڕژێمی قەیسەری گرنگییەکی ئەوتۆی بەکوردی ناوخۆی

ولاتەکەی خۆی نەدەدا، بەقەد ئەوەی گرنگیی بەکوردی دەرەوەی ڕوسیا دەدا، پێش جەنگی جیهانیی یەکەمیش ژمارەیەك قوتابخانەی ڕوسی لەناوچە کوردییەکانی ئەرمینیادا هەبوو، بەڵام ئەو قوتابخانانە لەساڵەکانی جەنگ و هەڵگیرسانی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی (١٩١٧) داو لەساڵەکانی دەستتێوەردانی سەربازیی ئیمپریالیدا دەرگانیان داخران.

پاش کۆتاییهاتن بەدەستتێوەردانی دەرەوەو شەڕی ناوخۆ، لەساڵی (١٩٢٠)ەوە بەڵشەفییەکان هەستان بەدامەزراندنی چەند قوتابخانەیەك ی کوردی کەبۆ یەکەمجار بوو لەمێژووی نوێدا بەزمانی کوردی تیایدا بخوێندرێت، بەڵام ئەو ئەلفوبێیەی لەو قوتابخانەداو لەسیستمی خویچندندا بەکاردەهات ئەلفوبێیەکی کوردی بوو کەلەسەر بنەمای پیتە ئەرمەنییەکان دامەزرابوو و لەلایەن (ئاکوب گازریان)ی زمانەوانی ئەرمەنییەوە دانرابوو کە بە (لازو) ناسرابوو. سەرەتا ئەم قوتابخانانە تەنها تایبەت بوون بەکوردەکانی دانیشتووی ئەرمنیاو تەنها لەوێ کرانەوە، بەڵام لەساڵانی دواتردا چەندین قوتابخانەی تر لەچەند ناوچەیەکی جۆرجیاو ئازەربایجانیش کرانەوەو دامەزران، یەکەمین کتێبیش بۆ فێرکردنی خوێندنەوە نووسین بەو ئەلفوبێیە بوو کەناونیشانێکی شاعیریی هەبوو کەئەویش (الشمس-ڕۆژ) بوو. ئەم ئەلفوبێیەش وەك ئەوانەی پێش خۆی لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی زمانی کوردیدا نەدەگونجاو بەڕاست و دروستییش دەربڕینێکی تەواوی دەنگە کوردییەکان نەبوو، بەڵکو بەشێوەیەك بوو کەکێشەی زۆری لەبواری پەروەردەو فێرکردندا دروستدەکرد. کاتێکیش سکالای مامۆستاکان لەڕۆژنامەی (سپێدەی ڕۆژهەڵات-فجر الشرق)دا کە لەتفلیس دەردەچوو لەچوارچێوەی چەند وتارێکدا ئاژتوەو ئاشووبێکیان نایەوە، کەتیایدا بانگەشەی ئەوە دەکرا تا ئەلفوبێیەکی لاتینیی جێگرەوەی ئەوەی بەکاردەهات بهێنرێتە کایەوە، کە لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی زمانی کوردیدا بگونجێت و پرۆسەی پەروەردەو فێرکردنیان بۆ ئاسان بکات[٣]، هەر بۆیە ئەو ئەلفوبێیەش بەدەری ئەوانی پێشووتر چوو.

**٣-یەکەم ئەلفوبێی لاتینیی زمانی کوردی**

پاش ئەوەی لەساڵی (١٩٢٤)دا (عەرەب شەمۆ) بەپلەیەکی بەرز لەپەیمانگای ڕۆژهەڵاتناسیی مۆسکۆ دەرچوو، کەئەوەش یەکەمین کوردی سۆڤێتی بوو کەبڕوانامەیەکی بەرز بەدەستبهێنێت، هەر بۆیە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتیی پەیمانگای ناوبراوەوە پێشنیاری بەردەوامبوون لەسەر خوێندنی بۆکرا تا بڕوانامەی دکتۆرا لەزمانی کوردیدا بەدەستبهێنێت، بەڵام بڕیاری ئەو وابوو کەئەو کارە بۆ کاتێکی تر دوابخات، ئەویش لەبەرئەوەی میللەتەکەی پێویستییەکی زۆری پێیەتی.

عەرەب شەمۆ گەڕایەوە یەریڤان و هێندەی نەبرد زۆر بەخێرایی لەنێو کوردی ولاتەکەیدا دەرکەوت و بووە هەڵسووڕێنەری بزوتنەوەی هۆشیاریی ڕۆشنبیریی، کەبزوتنەوەیەك بوو سەرجەم لایەنەکانی ژیانی لەخۆگرتبوو. بۆ ئەو مەبەستەش سەرەتاو هەنگاوی یەکەم گرنگیی بەنەهێشتنی نەخوێندەواری دا لەنێو ڕۆڵەکانی گەلەکەیدا، هەنگاوی دووەمیش ڕزگارکردنی ژنان بوو پاشان ڕاستەوخۆ هەستا بەسەردانی مەیدانیی ژمارەیەك گوندی کوردنشین لەپێناو ڕێکخستنەوەی ژیانی کورد لەسەر بنەمایەکی نوێ و هاوچەرخی دوور لەغەیبیانییەت، هەروەها هەوڵێکی چڕوپڕیشی خستەگەڕ بۆ کۆکردنەوەو پۆلێنکردن و بەدواداچوون و بڵاوکردنەوەی کەلەپووری کوردی. پاش ماوەیەکی کەمیش لەلیژنەی مەرکەزیی حزبی بەڵشەفی ئەرمەنیدا کرایە بەرپرسی کاروباری کورد، لەبەرئەوە شتێکی سەیر نەبوو ەچاوی ئەوە لەعەرەب شەمۆ بکرێت تا چارەسەرێك بۆ کێشەی ئەلفوبێی کوردی دابنێت، بەتایبەت پاش ئەوەی سەبارەت بەکێشەو گرفتەکانی کورد لەکۆمارەکانی ئەودیو قەفقاسدا لێدوانێکی ڕۆژنامەوانیی داو تیایدا تیشکی خستبووە سەر ئەو کێشەیە[٤]، هەر بۆیە ئەوەی پێشبینیی دەکرا ڕوویدات، ڕوویدا، بەو شێوەیە لیژنەی مەرکەزیی پارتی ناوبراو ئەرکی دانانی ئەلفوبێیەکی لاتینیی بۆ زمانی کوردیی پێ سپارد، هەر بۆیە پاش هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆر چڕوپڕ، لەلایەن عەرەبی شەمۆوە، ئەویش بەتوێژینەوە لەفۆنەتیکی زمانی کوردی و وەسف و پۆلێنکردن و چەسپاندنی دەنگە کوردییەکان بەپێی دەرچوونیان لەزارو شێوەی گۆتنیان، هەروەها بەراوردکردنیان بەهاوشێوەکانیان لەزمانە ئێرانییەکانیشدا، توانیی بەشێوەیەکی ورد دەستنیشانی ژمارەیەك پیت و دەنگە بزوێن و نابزوێنەکان بەزمانی کوردیدا بکات و یەکەمین ئەلفوبێی لاتینیی کوردیی تەواو بۆ زمانی کوردی دابڕێژێت و بهێنێتە کایەوە، کەتا ئەم ساتەش باشترین وردترین ئەلفوبێی لاتینیی کوردییە لەلایەنی دەربڕینی دەنگە کوردییەکانەوە. هەر بۆیە بەباشی دەزانین لێبگەڕێین خودی عەرەبی شەمۆ سەرگوزەشتەی ئەوباسەو دروستبوونی ئەو ئەلفوبێیەمان بۆ بگێڕێتەوە[٥]:

بەهاری ساڵی (١٩٢٥) بوو، لەچەند لایەنێکەوە تێکەڵ بەکاری ڕۆژنامەی خەوم بووبووم، کاتێك لەلایەن وەزیری مەعاریفی ئەرمەنییەوە، کەشۆڕشگێڕێکی بەلشەفیی کۆن بوو و ناوی (مرافیان) بوو داوایەکم پێگەیشت، تا چاوم پێی بکەوێت، بێ ئەوەی هۆکاری چاوپێکەوتنەکەش بزانم، لەکاتی دیاریکراودا چووم بۆ نووسینگەکەی و پاش بەخێرهێنانم کەوتە قسەو وتی:

-لەو بڕوایەدام کەتۆ لەیەکێتیی سۆڤیەتدا دەرکەوتووترین ڕۆشنبیری کوردیت، واتا کارتە براوەکانت لەدەستدایە..

پاش کەمێك بێدەنگبوون، زەردەخەنەیەکی سووکی لەسەر رووی نەخشاند، وەك ئەوەی چاوەڕوانی وەڵامێك لەمنەوە بکات..

منیش وتم:

*وەزیری هاوڕێم.. ببوورە لەمەبەستەکەت نەگەیشتم..

-شتەکە روون و ئاشکرایە.. ئێوەی کورد تائێستاش ئەلفوبێیەکی کوردیی راستەقینەتان نییە، (ئاکوب گازریان) یاخود ئەو کەسەی لێرە بە(لازۆ) ناویدەبەن، ئەلفوبێیەکی ئەمرەنیی بۆ زمانی کوردیی داناوە، بەڵام لەلایەن مامۆستایانەوە سکاڵایەکی توندی لەدەستدەکرێت، بەوەی ئەو ئەلفوبێیە دەربڕینی کوردیی دەشێوێنێت، هەر بۆیە بووەتە بەردی سەرڕێی پەروەردەو فێرکردن بەزمانی کوردی، پاشان وابزانم لەبۆنەیەکیشدا شتێکت لەو بارەیەوە درکاندبوو و باستکردووە..

وەك ئەوەی بمەوێت پۆزش بهێنمەوە، وتم:

*بەڵێ ئەوە وایەو وتوومە، بەڵام ئایا ئێوە لەو بڕوایەدان ئەوەی وتوومە وانییە..؟ پاش ئەوەش لەزمانی کوردیدا چەند دەنگێك هەن کە لەزمانی ئەرمەنیدا نین و بەرگوێ ناکەون، هەروەك چۆن لەزمانی ئەرمەنیشدا چەندین دەنگ هەن کە لەزمانی روسیدابەرگوێ ناکەون و نەبیستراون..

-کێ ئینکاریی لەوە کردووە..؟ ئەوەی کەتۆ تەسەوری دەکەیت وەك تۆ دژیم و لەگەڵتم. تۆ دەزانیت ژمارەیەکی زۆر کەمە نەتەوە لەیەکێتیی سۆڤییەتدا بەکردارەکی بۆ یەکەمجارە هەستاون بەدانانی ئەلفوبێیەك بۆ زمانەکانیان و ئێستا لەپرۆسەی پەروەردەو فێرکردن و رۆشنبیریدا بەکاریدەهێنن، چەندانی تریشیان بەهەمان مەبەست لەنیوەی رێدان، هەر بۆیە پێشنیاردەکەم تۆ ئەلفوبێیەکی لاتینی بۆ زمانی دایکت دابنێیت و بهێنیتە ئاراوە، وا بزانم کەسیش نییە بتوانێت بەو کارە هەستێت جگە لەڕۆشنبیرێکی کورد، بەمەرجێك تواناو زانست و زانیاریی پێویستیی بۆ کارێکی زانستی و بەرپرسانە هەبێت..

پاش کەمێك وەستان و بیرکردنەوە، مرافیان وتی:

-تەنانەت لەنێو ئێمەی ئەرمەنیشدا هەیە بانگەشەی بەکارهێنانی پیتی لاتینی دەکەن، بەڵان خۆت دەزانیت تەمەنی ئەلوبێیەکەی ئێمە هەزارو پێنج سەد ساڵە، پاش ئەوەش رەوشی ئێمە کەمێك جیاوازترە..

*لەئەستۆگرتنی ئەو کارە دەترسم، بەڵام نازانم تا ئاستی پێویست سەرکەوتوودەبم تیایدا یان نا..؟

-بۆ سەرکەوتوو نابیت..؟ بەدڵنیاییەوە سەرکەوتوودەبیت، ئەی گوایا تۆ دەرچووی پەیمانگای لازارییف بۆ زمانە رۆژهەڵاتییەکان نیت..؟!

وتم:

*ئەوە شتێك بوو رۆشت..!!

-لەچی دەترسیت..؟ پێویستە دەستبەکاربیت، لەبەرئەوەی لەکەسی تر رانابینم شایستەی ئەوە بێت بەو کارە هەستێت.. تێدەگەیت دەڵێم چی..؟ کەس نییە تۆ نەبێت..!

*بەڵام من لەلیژنەی مەرکەزیی حزب کاردەکەم.. چۆن دەبێت بێ رازیبوونی حزب ئەو کارە قبووڵ بکەم..؟

-من بەناوی لیژنەی مەرکەزیی حزبەوە ئەو کارەت پێ دەسپێرم و داوام لێکراوە ئەو کارەت بخەمە ئەستۆ، جا ئیتر چۆن دەتوانیت رەتی بکەیتەوە..؟ هەرچەندە ئەو کارە رایچەڵەکاندیت، بەڵام لەئێستاوە چی لەتواناتدایە بیخەگەڕو خۆت گورجکەرەوەو بێ ترس دەستبەکاربە، هەر کێشەیەکیشت هاتەڕێ، دەتوانیت پرس بەهەریەك لەپرۆفیسۆر (ئاجاریان) و پرۆفیسۆر (کابانتسیان) بکەیت..

پاشان لای خۆیەوە عەرەب شەمۆ بەقووڵیی بیرێك لەمەسەلەکە دەکاتەوەو دەڵێت:

*بێ ئەوەی بڵێم (بەڵێ) یاخود (نەخێر) نووسینگەی وەزیرم جێهێشت، لەگەڵ ئەوەشدا دەستم بەکارە سەرەتاییەکان کردو لەکتێبخانە ئەلفوبێی کۆنی زمانی فارسیم خواست و ئەلفوبێی تورکیشم دەستکەوت، بەڵام زۆر بەدەگمەن بەکارم دەهێنا، بەکتێبی ئەلفوبێی کوردییش بەڕێنووسی ئەرمەنی کە(لازۆ) داینابوو خۆم چەکدارکرد، هەموو ئەوانەش تەنها بۆ مەبەستی بەراوردکاری بوون، پاشان نوسخەیەك لەو توێژینەوەیەشم دەستکەوت کە (یکیزیارۆڤ) نووسیبووی و لەساڵی (١٨٩١) دا لە(بڵاوکراوەی کۆمەڵەی جوگرافیای روسی-لقی قەفقاس)دا بڵاویکردبووەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کەچەندین هەڵەی تێدابوو و توێژینەوەکەی شێواندبوو، هەموو ئەوانەش لەڕێکخستنی کەرەستە سەرەتاییەکانی کارەکەمدا یاریدەیاندام[٦]..

جارێکیان (ئەمەش هەر وتەی عەرەب شەمۆیە) لەمیانەی یەکێك لەکۆبوونەوەکاندا، وا رێکەوت بەتەنیشت (مرافیان)ەوە دانیشتبووم، یەکسەر پرسیاری لێکردم و وتی:

-هاوڕێ شەمۆ.. کەی ئەفوبێیەکی کوردیمان دەکەوێتە بەردەست..؟

*لێتان ناشارمەوە کەتا ئێستاش ئەو ئەلفوبێیەی مەبەستتە دوورەدەست و کامڵ نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توانیومە لەبەرامبەر دەنگە کوردییەکاندا دەستنیشانی پیتە لاتینییەکان بکەم.

-ناوەرۆکی ئەلفوبێ هەروایە، با رۆژێك پێکەوە دابنیشین و تاووتوێی ئەوە بکەین کەتا ئێستا کردووتە.

عەرەب شەمۆ دەڵێت:

(لەدوای ئەو چاوپێکەوتنەوە، خۆم لەبینینی مرافیان دەپاراست، ئەویش لەبەرئەوەی زۆر دڵنیانەبووم کە تا چ ئاستێك سەرکەوتووم، نەشمدەوێرا ئەوەی بەرهەمم هێنابوو بیخەمەڕوو) بەتایبەت لای کەسێکی پایەبەرزی وەك وەزیر کەشارەزایی لەزمانەکاندا هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا بێوچان ماندوونەناسانە لەسەر کارکردنی جددیم لەپێناو بەرهەمهێنانی ئەو ئەلفوبێیەی داوام لێکرابوو درێژەم بەکارەکەم دا، لەمیانەی توێژینەوەشمدا بۆ یەکەمجار بوونی چەند نیشانەیەکی جیاکەرەوەی دیاردەی بەمێکردن و بەنێرکردنم

لەزمانی کوردیدا دۆزییەوە، کەپێشتر تێبینیم نەکردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا لەژیانی ڕۆژانەمدا بەکاریشیاندەهێنم. دیاردەی ڕەگەز نە لەزمانەکانی فارسی و نە زمانی تورکی و لەهیچ زمانێکی تری ڕۆژهەڵاتی تریشدا نییە. هەر بۆیە لەو بارەیەوە توێژینەوەکانم ڕاگرت بۆ داهاتوو، کە لەپاشاندا لەمیانەی خۆئامادەکردنمدا بۆ بەدەستهێنانی نامەی دکتۆراکەم لەئەکادیمیای زانستە سۆڤێتییەکان لەناوەڕاستی سییەکاندا[7] توانیم توێژینەوەیەکی زانستی لەو بارەیەوە ئەنجامبدەم.

لەدوای مێزەکەمەوە دانیشتم تا ئەو ئەلفوبێ لاتینییە بەسەر داهێنانێکی خۆمدا تاقیبکەمەوەو بەکاربهێنم، بۆ ئەو مەبەستەش یەکەم ڕۆمانی خۆم پێ نووسی کەئەویش ڕۆمانی (شوانی کورد) بوو[8].

پاشان عەرەب شەمۆ درێژە بەوتەکانی دەداو دەڵێت:

*ڕۆژێکیان لەماڵەوە لەنووسینگەکەی خۆمدا لەیەریڤان دانیشتبووم و بۆ دواجار پێداچوونەوەم بەڕەشنووسی ئەلفوبێ تازەکەدا دەکردەوە، گوێم لێبوو لەدەرگایان دا، منیش بێ ئەوەی سەرم بەرزبکەمەوە، وتم:

*فەرموو.. وەرە ژوورەوە.

بەهێواشی دەرگاکە کرایەوەو پیاوێکی پیری سەرسپی هاتە ژوورەوە، لەجیاتی ڕیشی سەکسوکەیەکی هێشتبووەوە، پاش ئەوەی سڵاوی لێکردم، کەوتە دوان و وتی:

-ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم.. تۆ عەرەب شەمۆیت و کوردیت..!!

من کاتی خۆی لە(زور) کەشارۆچکەیەکی کوردییە مامۆستابووم، خۆشت دەزانیت کەڕوسەکان قوتابخانەیەکیان بۆ کورد تێدا کردبووەوە، کەخوێندن تیایدا بەزمانی ڕوسی بوو. من مامۆستای ئەو قوتابخانەیە بووم کە لەساڵی (١٩١٧) دا داخراو لەو کاتەشەوە بێکارم. تکام وایە یارمەتیم بدەیت تا لەیەکێك لەو قوتابخانە کوردییانەدا کەتازە دامەزراون بەمامۆستا دابمەزرێم. واشم بەرگوێ کەوتووە کەتۆ لەلیژنەی مەرکەزیی حزب بەرپرسی کاروباری کوردەکانیت.. ناویشم (مارکۆلۆڤ)ە.

مارکۆلۆڤ ڕوسییەکی زۆر باشی دەزانی و دەیتوانی بێ هیچ کێشەیەك پێی بدوێت، بەڵام زمانی دەیگرت و لەکۆتایی هەر ڕستەیەکدا ماوەیەك بۆ دەوەستا، وەك ئەوەی ئیملا بەقوتابییەکانی بکات، پاشان لەکۆتاییدا عەرزوحاڵێکی نووسراو یاخود نووسینێکی خستە سەر مێزەکەم کە بەخەتێکی جوان و بەزمانی ڕوسی ڕازێنرابووە.. منیش بە(مارکۆلۆڤ)م وت:

*بەڵام ئێستا لەخوێندنگاکاندا وانەکان بەکوردی دەوترێنەوە.

ئەویش درێژەی بەوتەکانی داو وتی:

-تۆ کرمانجی زانی..؟

پاش تۆزێك وەستان، بەزمانی ڕوسی وتی:

-دەزانم چی دەڵێیت.. کاتی خۆی کوردیم دەزانی، بەڵام لەبیرم چووەتەوە، ئەگەریش ماوەیەك لەیەکێك لەو قوتابخانە کوردییانەدا کاربکەم، ئەوا بەخێراییو سەرلەنوێ فێری دەبمەوە.

*بەڵام ئەو ئەلفایەی ئێستا لەوتنەوەی وانەکاندا بەکاردێت، بەپیتە ئەرمەنییەکانە، جا نازانم تۆ ئەو پیتانە دەناسیت یان نا..؟

-پیتە ئەمەرنییەکان نازانم، بەڵام من کەسێکی پەروەردکارم و دەتوانم بەچەند ڕۆژێك فێری ببم.

*هاوڕێ مارکۆلۆڤ.. ببوورە شتی وا نابێت، ئەگەر تۆ زمانی کوردی و پیتە ئەرمەنییەکانیش نەزانیت، ئەوا کارەکە ئاسان نییەو زۆر گرانە.

پاش کەمێك بیرکردنەوە وتم:

*گوێبگرە مارکۆلۆڤ.. ئێستا من بەڕەشنووسی ئەلفوبێیەکی لاتینیی نوێی زمانی کوردیا دەچمەوە، کەخۆم ئامادەم کردووە، لێرەش لەیەریڤان پێشانی گەورە زانایانی زمان داوەو مایەی ڕەزامەندییان بووە، منیش ئەوەم نییە سەرلەنوێ بینووسمەوە. پاشان پێشەکی و ڕوونکردنەوەو نموونەکان بەزمانی ڕوسی نووسراون، تۆ دەتوانیت سەرلەنوێ بەو خەتە جوانەت بینووسیتەوە..؟ دڵنیاش بە لەوەی لەبەرامبەردا پاداشتی خۆت وەردەگریت.

پاش ئەوەی گشت دەنگ و پیتەکان و ئەو نموونانەشم کە بۆ ڕوونکردنەوە بەکارمهێنابوون بۆ ڕاڤەکرد.

مارکۆلۆڤ وتی:

-بۆچی نا..! بەخۆشحاڵییەوە.. ئەگەر بشتەوێ و ڕازی ببیت هەندێك کەموکوڕیشی تێدایە ئەوانیشت بۆ ڕاست دەکەمەوە.

*زۆر سوپاست دەکەم و مەمنونیش دەبم، لەبەرئەوەی من بەهەندێك کاری ترەوە سەرقاڵم و ئەو کاتەم نییە سەرلەنوێ ودووبارە بینووسمەوە.

پاش مانگێك، مارکۆلۆڤ هاتەوە بۆلام و لەگەڵ خۆیدا (ئەلفوبێ) نوێیەکەی بۆ هێنابوومەوە کە بەخەتێکی جوان نووسیبوویەوە. مارکۆلۆڤ وتی:

-بەخەتێکی زۆر چاکتر لەهەر ئامێرێکی چاپ دوو نوسخەم بۆ نووسیویتەوە، دەمەوێت ئەوەش بڵێم کەتا ئێستا هیچ ئامێرێکی چاپی کوردی نییە، بەڵام گومانم لەوەدا نییە کە لەداهاتوودا هەر پەیدادەبێت[9].

ئەو ڕووداوە لەڕۆژێکی بەهاریی ساڵی (١٩٢٧) دا بوو، کاتێك چووم بۆ بینینی وەزیرو ئەلفوبێ لاتینییە نوێیەکەم لەگەڵ توێژینەوەیەکی دووردرێژیی پاڵپشت بەڕوونکردنەوەو نموونەی سەلمێنراوو بەکارهاتوودا پێشکەشکرد. یەکسەر وەزیر بەچڕی و بەوردی سەرنجی تەواوەوە دەستیکرد بەخوێندنەوە، ناو بەناویش دەیپرسی: بۆ ئەم پیتە لاتینییەت بۆ ئەم دەنگە کوردییە هەڵبژاردووە..؟

لەگەڵ نموونەی سەلمێنراودا ڕوونکردنەوەیەکی چڕوپڕی بابەتەکەم بۆکرد، پاش ئەوەی وەزیر لەخوێندنەوەی بووەوە، وتی:

—هیچی ئەوتۆی نەماوە ئەوە نەبێت کەئەلفوبێیەکەت لەئەکادیمیای زانستە سۆڤێتییەکان پێشانی زانایەکی زمان بدەیت تا ڕێ بەشیاویی بابەتەکەت بدات بۆ پیادەکردن و بەکارهێنانی، تا ئێمەش بتوانین کتێبی ئەلفوبێ نوێیەکەو کتێبەکانی تری قوتابخانە بەچاپبگەیەنین.

بەمرافیانی وەزیرم وت:

*زمانەوانە ئەرمەنییەکانیش پێشنیاریان کرد تا ئەلفوبێیە نوێیەکەم پێشانی یوسف ئیکارۆڤیچ ئۆربیللیی ئەکادیمیست بدەم[١٠].

پێشتر زۆرم لەبارەی ئۆربیللیی ڕۆژهەڵاتناسەوە بیستبوو، بەوەی کەناودارترین کوردۆلۆژیستی سۆڤێتییە، کە لەشاری لینینگراد دادەنیشت، بەڵام زۆر دوودڵ بووم، هەر بۆیە خۆم بەخۆمم دەوت: تۆ بڵێیت پێشوازیم لێبکات وکاتی ئەوەی هەبێت تا تاووتوێی بابەتەکەم بکەم، چونکە بێگومان بووم لەوەی کاتێکی دووروودرێژی دەویست.

مرافیان نامەیەکی بۆ ئۆربیللی بۆنووسیم و سواری شەمەندوفێر بەرەو لینینگراد بەڕێکەوتم. ئەو کاتیش لەسەرەتای وەرزی بەهاردابووین و کەشوهەوای یەریڤانیش گەرمبوو. بۆ ئێوارەی



ڕۆژی دوایی گەیشتمە لینینگرادو بەکسەر بەرەو ئەو شوێنە بەڕێکەوتم کەئەو زانا بەناوبانگەی لێ نیشتەجێبوو. بەدوو دڵی و سەرسامییەوە لەبەردەم دەرگای شوققەکەیدا وەستام و تادەهات لێدانی دڵیشم خێراتردەبوو، دواجار بەخۆمدا هاتمەوەو غیرەتم دایە بەرخۆم و دەستم بەزەنگەدا نا. پیاوێکی شکۆدارو بەشان و شەوکەت دەرگاکەی لێکردمەوە، کەڕیشێکی چڕو قژێکی درێژی بەردابووەوە، کەهەر بەقەشە مژدەدەرەکان دەچوو، تەنها جیاوازی نێوان ئەم و ئەوانیش ئەوەبوو کەئەم ریشی سوورنەبوو، بەڵکو ماشوبرنجی بوو.

ئۆربیللی وتی:

—ئەی هاونیشتمانی چیتدەوێت..؟

دانەویمەوەو لەجانتاکەمدا نامەکەی وەزیرم دەرهێناو دامەدەستی، لەوکاتەدا کەنامەکەی دەخوێندەوە، بۆم دەرکەوت کەئەو پیاوە خودی ئۆربیللی یە، هەر بۆیە گشت سەرنجەکانم بەقووڵی ئاراستەی دەموچاوی کردو، لەپڕێکدا ئۆربیللی بەکوردی وتی:

—سەر سەرە، سەر چاڤا.

دووبارە بەزمانی روسیش وتی:

—بەخێربێ.. فەرموو وەرە ژوورەوە، دەبێت لای من بمێنیتەوە.

منیش بەنیازی ڕەتکردنەوەی داواکەی وتم:

*یوسف ئیکارۆڤیچ نابێت،، دەچم بۆ هۆتێل..

—ڕێنادەم بڕۆیت.. لەناو کورددا زۆر ژیاوم و نان و پیازم لەگەڵ خواردوون و دابو نەریتیشیان باش دەزانم. پاش ئەوەش من ئەرمەنیم.

بەنیازی ڕۆشتن جانتاکەم هەڵگرت، بەڵام ئۆربیللی زۆری لێکردم و وتی:

—تۆ میوانی منیت و ناهێڵم بچیتە هیچ ئوتێلێکیش.

جگە لەگوێڕایەڵیکردنی ئۆربیللی هیچ چارێکم نەما..

چوومە ژوورەوە بۆ شوققەکەی ئۆربیللی، کاتێک پاڵتۆ نەنکە تەڕبووەکەی بینی لەبەرمدا وتی:

—تووشی ئەنفلۆنزا دەبیت.. پاڵتۆکەت دانێ تاوشکی بکەینەوە.

پاش نانی ئێوارە، ئۆربیللی وتی:

—با داهێنانەکەت ببینم..!

ئەوە سەرەتای کاری ڕاستەقینە بوو، ئەو زانا ئەکادیمییە پرسیاری سەبارەت بەهەموو دەنگێك دەکرد و لەبەرچییش ئەو پیتە لاتینییەم بۆ هەڵبژاردووە..؟ لەبەرامبەر هەر دەنگ و پیتێکیشدا بیست جار پێی دووبارە دەکردمەوە.. گفتوگۆکان تا دوای نیوەشەو بەردەوامدەبوون. ئەو هەوڵەو ئەوکارە بێوچان و بەردەوامە هیلاکی کردم، زۆربەی جاریش لەهاتنەکەم پەشیمان بووم کەئەو کارە گرانەم گرتە ئەستۆی خۆم، بەڵام هەر زووش پەشیمان دەبوومەوە، پاش بەسەربردنی دە ڕۆژ بەو جۆرە، ئەو زانا

بەخشندەیە لەبارەی ئەلفوبێیەکەمەوە رای خۆی بۆ نووسیم و لەنامەیەکی وەلامنامێزدا بۆ مرافیانی وەزیر رازیبوونی لەسەر پیادەکردن و کارپێکردن بەئەلفوبێکەی دەربڕی.

هەر بەشەمەندوفێر گەڕامەوەو لەشەوێکی درەنگ وەختدا گەیشتمەوە یەریڤان، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کەزۆر هیلاکبووم و (کاتەکەش شیاو نەبوو بۆ سەردانکردن)، بەلام یەکسەر رووم کردە ماڵی ئەو وەزیرەی کەبەسەردانەکەم و لەو کاتە درەنگەدا سەرسام نەبوو، هەر بۆیە پاش خوێندنەوەی نامە وەلامنامێزەکەی ئۆربیللی وتی:

-ئێستا بەدڵنیایی و بڕوابەکی تەواوەوە دەتوانین کار بەئەلفوبێیەکە بکەین و بیخەینە بەردەست.

ئەوەی راستیش بێت پێش گەشتەکەم بەرەو لینینگراد، مژدەی کارپێکردنی ئەلفوبێیەکەم درابوویێ، هەر بۆیە دەستمانکرد بەچاپکردنی کتێبی وانەی ئەلفوبێ نوێیەکە بۆ قوتابخانەکان، هەر بەو ئەلفوبێ نوێیەش یەکەمین رۆژنامەی کوردی لەیەریڤان دەرچوو و بوومە یەکەم سەرنووسەریشی، ئەو رۆژنامەیەش رۆژنامەی (ریا تازە) بوو. ئەلفوبێیەکەش بووە ئەلفوبێیەکی بڕیارلێدراوی فەرمی بۆ کوردەکانی یەکێتیی سۆڤێتی لەکۆمارەکانی (ئەرمینیا، جۆرجیا، ئازەربایجان، تورکمانستان و ..هتد).

## ٤-کاریگەرییە فرە لایەنەکانی ئەلفوبێ نوێیەکەو دەنگدانەوەی لەدەرەوەی ولاتدا

پاش کارپێکردن بەئەلفوبێ نوێیەکە لەساڵی (١٩٢٧) دا، کەئیتر بووە خاڵی وەرچەرخان بۆ بەرخۆدانێکی رۆشنبیری و زانستی و کۆمەلایەتیی فرە لایەنی کوردەکانی دانیشتووی ئەودیو چیای قەفقاس. لەپەروەردەو فێرکردندا بەکارهات و بەهۆیەوە ژمارەی نەخوێندەوارەکان بەرەبەرە کەمکرانەوەو پاشان لەساڵەکانی داهاتوودا بەتەواوی دەست بەسەر نەخوێندەواریدا گیراو نەهێڵرا. رۆژنامە کوردییەکانی بەو ئەلفوبێیە دەرچوون، کاتێکیش یەکەم پەیمانگای ئامادەکردنی مامۆستایانی کورد دامەزرا، سەدان گەنج و لاوی کورد لەسەرتاسەری ئەودیو قەفقاسەوە پەیوەندییان پێوەکرد، کەبەو ئەلفوبێ نوێیە وانەکانیان خوێند و وەرگرت. عەرەب شەمۆش بووە یەکەمین راگری ئەو پەیمانگا فێرکارییە گرنگە.

لەلایەن عەرەب شەمۆ-یشەوە یەکەمین رۆمان کەرۆمانی (شوانی کورد)ی پێگەیشتوو لەرووی بیروبۆچوون و هونەرییەوە بەو ئەلفوبێ نوێیە نووسرایەوە، کەوەرگێردرایە سەر ژمارەیەك لەو زمانانەی لەیەکێتیی سۆڤێتی پێشوودا قسەی پێدەکراو هەروەها بۆ سەر زمانە ئەوروپاییەکانیش، ئەو رۆمانەش بەمانا هاوچەرخەکەی چەمکی رۆمان لەمێژووی نوێی ئەدەبی کوردیدا یەکەم رۆمان بوو. هەر ئەم ئەلفوبێ لاتینییە تەواوە، کەلەگەڵ (تایبەتمەندییەکانی گۆتن و قسەکردنی کوردی زیندوو و رێزمانی کوردیدا بەتەواوی دەگونجا)، بووە یەکێك ئەلفوبێیەك لەگشت بوارەکانی زانست و ئەدەب و هونەرو فەلسەفەو ئەوانی تردا بەکاردەهات، کاریگەرییەکانیشی بەتەنها هەر لەسەر یەکێتیی سۆڤێت نەبوو (کە لەرۆژنامە ناوخۆییەکاندا لەبارەیەوە وتاری زۆر نووسران و دەرکەوتن)[11]، بەڵکو درێژبووەوە تا خودی سەرجەم ناوچەکانی کوردستانیشی گرتەوە، ئەمیر کامەران بەدرخان-یش بەخۆشحاڵییەوە پێشوازیی لەو ئەلفوبێیە کردو چەندین وتاری دەربارەی نووسی[12] هەر بەکاریگەریی ئەلفوبێکەی عەرەب شەمۆشەوە بوو کەکوردەکانی سوریا هەستان بەهێنانەکایەی ئەلفوبێیەکی لاتینی بۆ زمانی کوردی، کە لەسەر بنەمای ئەلفوبێی تورکی دارێژرابوو[13]. هەر وەك زانراویشە کەزمانی تورکی دەچێتەوە سەر خێزانی ئەو زمانانەی کەزۆر لەزمانە هیندۆ-ئەوروپاییەکانەوە دوورەو زمانی کوردیش دەچێتەوە سەر لقێکی ئەو زمانە کەخێزانی زمانە ئێرانییەکانە.

لەکوردستانی عیراقیش، لەلایەن (تۆفیق وەهبی) یەوە ئەلفوبێیەکی لاتینی بۆ زمانی کوردی لەسەرەتای سییەکاندا پێشنیارکرا، بەلام رێی دەرنەبرد بەرەو بەکارهێنانێکی کردارەکیی بەرفراوان، بەلام ئەلفوبێکەی عەرەب شەمۆ لەلایەن ناوەندە رۆژهەلاتناسییەکانی ئەوروپایشەوە پێشوازیی لێکراو بۆ یەکەمین جاریش گفتوگۆی گەرموگوڕ لەبارەی ئەو مەسەلەیەوە کرا، کە لەومیانەشدا سەرجەم ئەلفوبێ بەکارهاتووەکان لەنووسینی کوردیدا نمایش و راڤەکران و چەندین تێبینی و پێشنیاریش سەبارەت بەو بابەتە دەرکەوتن[14]. بەگشتی دەکرێت بوترێت: (ئەلفوبێکەی عەرەب شەمۆ هێزی پاڵنەری ئەلفوبێی کوردی بوو لەسەرجەم خودی پارچەکانی کوردستاندا. بەلام ئەوەی جێی داخە ئەوەیە کەلەو کاتەدا رەوشەکان هێندە نالەباربوون کەنەتوانرا چ لەکوردستانی عیراق و چ لەپارچەکانی تری کوردستانیش ئەو ئەلفوبێیە بەکاربهێنرێت.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەم داهێنانە زانستییە گرنگە بۆ کوردی روسیای سۆڤێتی، خاڵێکی رۆشن بوو، بەڵکو لاپەڕەیەکی پرشنگداربوو لەمێژووی رۆشنبیریی کوردیداو داهێنانێکی گرنگی نووسەرو زانایەکی لێهاتوو و دەرکەوتووش بوو کەسەرجەم داهێنانەکانی ژیانی بۆ خزمەتکردنی گەلە رەسەن و دێرینەکەی تەرخانکرد، ئەو داهێنانەش شاکارێکی زانستی بوو کە لەلایەن نەوەکانی داهاتووەوە بەرێزو شانازییەوە یادی دەکرێتەوەو باسدەکرێت.

## پەراوێزو تێبینییەکان:

١-ذ. موسيليان ((ببيلوغرافيا الدراسات الكردية)) باللغة الروسية، دار نشر الآداب الشرقية، موسكو، ١٩٦٣.

٢-ل. زاكورسكي : ((الأبجديات القفقاسية))، ((نشرة الجمعية الجغرافية الروسية ± فرع القفقاس، ١٨٨٧م، المجلد التاسع، الملحق ١ ص١ -٣٢، وتارێکە سەبارەت بەسەرجەم هەوڵە نەزۆکەکانی بەکارهێنانی پیتە ئەرمەنییەکان بۆ نووسین بەزمانی کوردی، هەروەها هەوڵی پیۆتەر لیرخ-ی رۆژهەڵاتناسیش بۆ بەکارهێنانی پیتە لاتینییەکان بۆ هەمان مەبەست. لیرخ (١٨٢٨-١٨٨٤) بەیەکێك لەدەرکەوتووترین رۆژهەڵاتناسە روسییەکان دادەنرێت، کەزۆرترینی چالاکییەکانیان بۆ گەڕان و توێژینەوە سەبارەت بەمێژووی گەلی کوردو زمانەکەی تەرخانکردبوو، گرنگترین بەرهەمە دانراوەکانیشی، (دراسات حول الأكراد الأيرانيين واسلافهم الكلدانيين الشماليين) کەکتێبێکی قەبارە گەورەیەو لەسێ بەرگ دا لەساڵەکانی (١٨٥٦-١٨٥٨)دا لەبترسبۆرگ دەرچووە.

٣-صحيفة فجر الشرق، تفليس، الاعداد المرقمة (٥٤٠. ٩٤٣، ١٠٣٧، ١٢٢٢) الصادرة في (٢/٤/١٩٢٤، ٥/٨/١٩٢٥، ٢٥/١١/١٩٢٥، ٩/٧/١٩٢٦) بەدوای یەکدا، کۆمەڵە وتارێکە سەبارەت بەبانگەشەکردن بۆ بەکارهێنانی پیتە لاتینییەکان و وازهێنان لەپیتە ئەرمەنییەکان.

٤-((کاری حزبی لەنێو کوردە ئێزدییەکاندا))، گفتوگۆیەك لەگەڵ عەرەب شەمۆ-بەرپرسی کاروباری کورد لەلیژنەی مەرکەزیی حزبی شیوعیی ئەمەرنیدا. رۆژنامەی (فجر الشرق)، ژمارە (٦١٠)کە لەڕۆژی ٢٥/٦/١٩٢٦ دەرچووە ل٤.

٥-عەرەب شەمۆ، (ڕێگای کامەرانی) رۆمان، خانەی بڵاوکردنەوە (نووسەری سۆڤێتی)، مۆسکۆ ١٩٧١، ل٢٤١-٢٤٩.

٦-س.ا.یکیزیارۆڤ-ئیتنۆگرافییەکی ئەرمەنییە کەگرنگیی بەزمانی کوردی داوە، کەژمارەیەك نووسراوی ئەدەبی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی روسی، جگە لەو توێژینەوەیەش کەعەرەب شەمۆ ئاماژەی پێداوە، یکیزیارۆڤ بەهاوبەشی لەگەڵ (ل.ب.زاگورسکی)دا دوو معجەمیشیان بڵاوکردووەتەوە کەئەوانیش (فەرهەنگی روسی-کرمانجی) و (فەرهەنگی کرمانجی-روسی)ن، کە لەساڵی (١٨٩١) دا بڵاوکراونەتەوە.

٧-لەمیانەی ئامادەکردنی نامەی دکتۆراکەیدا، عەرەب شەمۆ بەهاوبەشی لەگەڵ قەناتی کوردۆییڤ و تسوکەرمان هاوڕێیدا سێ توێژینەوەی زمانەوانییان بڵاوکردووەتەوە: کەئەوانیش:

أ-(سەبارەت بەئیزافەو ئیزافەبۆکراو لەزمانی کوردیدا)، (شۆڕش و نووسین) ١٩٣٣، ژمارە ١ (١٦)، ل٥١-٥٨.

ب-(سەبارەت بەپیتە بزوێنەکان لەزمانی کوردیدا)، (شۆڕش و نووسین)، بەشی یەکەم، مۆسکۆ-لینینگراد، ١٩٣٣، ل١٧٩-١٨٠.

ت-(مەسەلەی بەنێرینەو بەمێینەکردن لەزمانی کوردیدا)، (شۆڕش و نووسین)، بەشی یەکەم، مۆسکۆ-لینینگراد، ١٩٣٣، ل١٦٠-١٧٨، ٤ خشتە.

٨-(شوانی کوردی)، (نۆڤلێت) ١٩٣٠، وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی روسی و لەمۆسکۆ لەساڵی (١٩٣١) دا بڵاوکراوەتەوە.

٩-مارکۆلۆڤ هەوڵی دا ناوی خۆی بخاتە ئەو کارە پیرۆزەوەو چەند وتارێکی لەڕۆژنامەی (فجر الشرق)دا سەبارەت بەئەلفوبێ نوێیەکە بڵاوکردەوە، لای هەندێك رۆژناهەڵاتناسیش جۆرە ئیلتیباسێکی دروستکرد، بەڵام ئەوەی راستی بێت دۆکیومێنتێك هەیە کە لەلایەن لایەنە بەرپرسە فەرمییەکانی ئەرمینیاوە دەرچووە کەدەڵێت: ئەو کارە بەعەرەب شەمۆ سپێردراوەو بەسەرکەوتوویش لەساڵەکانی (١٩٢٥-١٩٢٧) دا بەئەنجامی گەیاندووە، هەروەك ئەو بروسکەیەش کە لەلایەن یەکێتیی نووسەرانی سۆڤێتییەوە ئاراستەی عەرەب شەمۆکراوە بەبۆنەی (یادی لەدایکبوونی هەشتا ساڵەیەوە لە ٢٣/١/١٩٧٧دا ئاراستەی کراوەو لەڕۆژنامەی ئەدەبیی هەفتانەشدا کە لەمۆسکۆ دەردەچوو، کەزمانحاڵی یەکێتیی نووسەرانی سۆڤێتی بوو بڵاوکراوەتەوە) گرنگترین داهێنانە زانستی و ئەدەبییەکانی عەرەب شەمۆی تێدا باسکراوە، لەنێوانیاندا دانانی ئەو ئەلفوبێ لاتینییەیە بۆ زمانی کوردی. (بڕوانە: رۆژنامەی یەکێتیی نووسەرانی سۆڤێتی)-(لیتراتورنیا گازیتا)، ژمارە (٧) کە لەڕۆژی (١٩/٢/١٩٧٧دا دەرچووە)، هەروەها کاتی خۆیشی ئەو بروسکە گەرموگوڕە درێژە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی و لەگۆڤاری (شمس كردستان) دا، کە لەلایەن کۆمەڵەی رۆشنبیریی کوردییەوە دەردەچوو، لەدووتوێی سەروتاردا سەبارەت بەعەرەب شەمۆ بەو بۆنەیەوە بڵاوکراوەتەوە. (بڕوانە: جەودەت هوشیار، ((ايها الرائد العظيم سلاما")) ((شمس كردستان)) العدد (٤٥±٤٦) ىۆار نيسان ١٩٧٧ ص٦.

١٠-یوسف ئیکارۆڤیچ ئۆربیللی (١٨٨٧-١٩٦١) رۆژهەڵاتناسێکی ئەرمەنیی بەناوبانگ و دامەزرێنەری لقی کوردیی پەیمانگای رۆژهەڵاتناسیی لینینگراد بووەو تا کۆچیدوایشی کردووە، بەڕێوەبەری پەیمانگای ناوبراو بووە.

١١-رۆژنامەکانی یەریڤان و تفلیس، چەندین وتاری پێشوازی ئامێزیان سەبارەت بەو ئەلفوبێ نوێیە بڵاوکردەوە، کەپێدەچێت گرنگترینیشیان وتارەکەی یوسف ئۆربیللی ئەکادیمیست بووبێت کە لەرۆژنامەی (فجر الشرق) دا بڵاوکرایەوە، ژمارە (١٤٤٤)ی رۆژی (٦/٤/١٩٢٧)، کەوتارێکی بانگەشە ئامێزبوو بۆ کارکردن و پیادەکردنی ئەو ئەفوبێ لایتینییە، کەتیایدا نەگونجاندن و بێکەڵکیی بەکارهێنانی پیتە ئەرمەنی و روسییەکانی لەنووسینی کوردیدا بەتەواوی روونکردبووەوە.

١٢-کامەران بەدرخان: (سەبارەت بەئەلفوبێ کوردییە نوێیەکە)، رۆژنامەی (فجر الشرق)، ژمارە (١٢٠)ی رۆژی (٣/٥/١٩٢٩)، ل٢-کامەران بەدرخان: (جارێکی تریش لەبارەی ئەلفوبێ کوردییە نوێیەکەوە)، رۆژنامەی (فجر الشرق)، ژمارە (١٨٢)ی رۆژی (١١/٨/١٩٢٩).

١٣-جەلادەت بەدرخان: (ئەلفوبێی لاتینیی زمانی کوردی)، گۆڤاری (هاوار)-دیمەشق، ژمارەی رۆژی (١٥/٥/١٩٣١).

١٤-لەگۆڤارە زانستییە رۆژهەڵاتناسییەکانی ئەورووپاشدا سەبارەت بەو باسە چەندین وتار بڵاوکرانەوە کەپێدەچێت گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوە بووبن:

.Edmonds C.J-

Asuggestions for the use of Latin character in pp. 27 –(Journal ،January ،Writing of Kurdish 1931 of the Royal Asiatic society) 46

.Edmonds c.J -

Some developments in the use of Latin character pt ،July ،1933 ،for the writing of Kurdish – JARS .pp 620 – 642 ،III

.Minorsky V -

Remarks on the romanized Kurdish alphabet – .pp 643 – 650 ،pt III ،1933 July ،JARS

alphabet Kurde en caracteres ،Rondot p. L - Revue Armenie Sovietique des etudes ،latins d 1933 ((ch III pp. 411 – 417 ،islamigues))

adaption des caracteres latines et ،Rondot p. L - URSS – ،le. mouvment culturel chez les Kurdes de L 1935 ch. I pp 87-96 ،Re 1

# پێشەکیی چاپی یەکەمی سەبارەت بەمەسەلەی دەرەبەگایەتی لە نێو کورداندا

بەپێنووسی دکتۆر کەمال مەزهەر
وەرگێڕانی: سۆزان مەنمی

ئاسان نییە دەستنیشانی چوارچێوەی رووداوە مێژووییەکانی تایبەت بەهەر کۆمەڵگایەك بکرێت، بێ تێگەیشتنی روون و ئاشکرا لەپاشخانی ئەو رووداوانە کە بەهۆیەوە دەتوانرێت سەرجەم هاندەرو بزوێنەرە شاردراوەکانی پشت رەوت و گەشەکردنیان وەدەستبهێنرێن کە بەئاراستەی سەرکەوتن یاخود شکست بوون.

بۆ ئەوەش یەکەمین هەنگاو دەرخستن و روونکردنەوە یاخود زانینی واقعی ئابووریی-کۆمەڵایەتیی ئەو گەلەیە کەدەویسترێت لێکۆڵینەوە لەسەر قۆناغێکی مێژوویی دیاریکراوی ئەنجامبدرێت. کەپاشان وردە وردە ئەوە بووە راستییەك و زۆربەی ئەو مێژوونووسانەی سەر بەقوتابخانە فکرییە جیاوازەکانبوون باوەڕیان پێهێنا.

ئەگەریش تائێستا لەپێناو درککردن و زانینی ناوەڕۆکی رووداوەکان لەگشت سەردەمەکاندا، مێژووی گەلی کورد پێویستیی بەزنجیرەیەك لێکۆڵینەوەی جدی و بەردەوام هەبێت، کەئەگەر بمانەوێت بەشێوەیەکی راست و دروست و زانستییانە لەو (تەلیسمە) کوردییە تێبگەین، ئەوا پێکهاتەی ئابووریی-کۆمەڵایەتیی ئەو گەلە تائێستاش بابەتێکی دەستلێنەدراوو پەی پێ نەبراوە کەچاوەڕوانی هەوڵ و ماندووبوون و تێکۆشانێکی پێویستە.

بەشێوەیەك ئەو توێژینەوانەی خراونەتە خزمەتی ئەو لایەنە هەستیارەی ژیانی گەلی کوردەوە مەحاڵە لەپەنجەکانی دەستێك تێپەڕبکات[1].

پێشتر وامان دەزانی ئەم راستییە بەتەنها بەسە بۆ دەستنیشانکردنی گرنگیی کتێبەکەی ا. شامیلیۆڤ-سەبارەت بەمەسەلەی دەرەبەگایەتی لەنێو کورددا[2]. لەڕاستیشدا ئەگەر بمانەوێت لەچوارچێوەیەکی بابەتیدا لەمێژووی کورد بگەین، دەبێت لەچوارچێوەیەکی واقعیدا لێکۆڵینەوە لەسەر مەسەلەی دەرەبەگایەتی لای کورد بکەین، کەبێگومان ئەم سیستمە کۆمەڵایەتییەش بەگشت جۆرو پێکهاتە ساکارو ئاڵۆزەکانییەوە پاشخانێکی بنەڕەتیی گەورەترین لایەنی ناسراوی مێژووی کورد پێکدەهێنێت، کەتا ئێستاش جێماوەی ئەم سیستمە میراتییەکەو لەفکری کورددا پێگەیەکی بەهێزی داگیرکردووە[3]، بەتایبەت لەوێنە ئاسانکراوە قاڵبگرتووە باوەکەیدا کەتا ئەمڕۆ لەگوندەکانی کوردستاندا پیادەدەکرێت.

ئەو کارەی باسیدەکەین کارێکی ئاسان نییە، چونکە لێکۆڵینەوەی سیستمی دەرەبەگایەتی و دەستنیشانکردنی

---

١-لێکۆڵینەوە جدییەکانی ئەم بوارە تەنها بەرهەمە دانراوەکانی نوسەری بەناوبانگ (شاکر خەسباك) و کتێبەکەی دکتۆر (عەبدولڕەحمان قاسملو-کوردستان و کورد، لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی-ئابووری) کە لەبنەڕەتدا بەزمانی سلاڤی نووسراوە (براتسلاڤ-١٩٦٤)، پاشان وەرگێڕدراوەتە سەر ژمارەیەك زمانی ئەورووپایی و رۆژهەڵاتی، هەروەها نامەکەی (دکتۆر عەلی گەلاوێژ-پەیوەندییە کشتوکاڵییەکان لەکوردستانی ئێرانی هاوچەرخدا) کە لەساڵی (١٩٥٥)دا لەباکۆی پایتەختی ئازەربایجانی سۆڤیەتی داکۆکیی لەو نامەیە کردووە، لەگەڵ ژمارەیەك لێکۆڵینەوەی ژمارەیەکی دیاریکراوی چەند رۆژهەڵاتناسێکی سۆڤیەتی، لەپێش هەمووشیانەوە بەرهەمە دانراوەکانی و.ڤیلچیڤیسکی دێت (بڕوانە پەراوێزی ژمارە ٦)و چند توێژینەوەیەکی کەم کە لەیەن دانەرە رۆژئاواییەکانەوە دانراون، بۆ نموونە کتێبەکەی (فریدریك پارت)-(F. Barth, principles of social organization in southern Kurdistan, Oslo, 1953.)

٢-شامیلۆڤ، سەبارەت بەمەسەلەی دەرەبەگایەتی لەنێو کورددا بەزمانی روسی، یەریڤان، ١٩٣٦. بۆ یەکەمجار لەژێر هەمان ناونیشاندا لەکاتنامەیەکدا (کێشەکانی مێژووی کۆمەڵگاکانی پێش سەرمایەداری)، وەك توێژینەوەیەك بڵاوی کردەوە، لینینگراد، ژمارە ٩-١٠، ١٩٣٤، لاپەڕە ١١١-١٢٤. (تەرجەمەی حەرفیی ناونیشانی کتێبەکە بریتییە لە"سەبارەت بەمەسەلەی دەرەبەگایەتی لای کورد")ە.

٣-وەك زانراوە دەرەبەگایەتی پێکهاتەیەکی ئابووری-کۆمەڵایەتیە کەکاریگەریی لەسەر سەرجەم لایەنەکانی ژیانی تاك و کۆمەڵەوە هەیە (لەوانەش شێوازی بیرکردنەوەو بەهاکان) لەقۆناغێکی مێژوویی دوور مەودادا، ئەمەش خۆی لەخۆیدا وادەکات لێکۆڵینەوە لەسەر گشت لایەنە جیاوازەکانی دەرەبەگایەتی شتێکی ئاسان بێت، پێشدەچێت هەرکەس بیەوێت بەرهەڵستیی چارەسەرکردنی مەسەلەی (دەرەبەگایەتیی کوردی) بکات، تاڕادەیەکی زۆر بابەتەکەی لا نوێ بێت، کەدەتوانێت سوود لەئەزموونەکانی لێکۆڵینەوە زانستییەکان ببینێت کەسەبارەت بەدەرەبەگایەتی ئەنجامدراون لەگشت ئەو دەڤەرانەی لەڕووی کات و شوێنەوە لەکوردستان دەچن.

لایەنەکان، ئەگەرچی تایبەت بێت یاخود گشتی، یەکێکە لەو کێشە کۆمەڵایەتییە هەستیارانەی بەبڕێکی زۆر کێشەو گرفت دەورەدراوە، کە لەبنچینەدا لەلەیەکچوونی لایەنێکی زۆری تایبەتمەندییەکانی ئەو سیستەمە لەگەڵ گشت قۆناغەکانی پێش کۆمەڵگای سەرمایەدارییەوە سەریهەڵداوە، پێش ئەوەی ئابووریی کشتوکاڵی و بەرهەمهێنانی سروشتی دەسەڵات بگرێتەدەست، هەروەها پێش جێگیربوونی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و گەشەکردنیان، جگە لەوەش بەهۆی ئەو جیاوازییە ئاشکرایەی لەسروشتی ئەو سیستەمەو قۆناغەکانیدایە بەپێی بوونی لەناوچەکاندا، لەبەرئەوە ناکرێت ئەوە لەچوارچێوەی سیستەمی دەرەبەگایەتیسدا قەتیس بکرێت. ڕەگوڕیشەی ئەو ناکۆکییانەش بۆ شێوەی زەوی و شێوازی بەگەڕخستن و هەروەها بۆ سروشتی سیستەمی سیاسیی دەرەبەگایەتی و چەند شتێکی تر دەگەڕێتەوە، کە تاڕادەیەکی زۆر ئەرکی لێکۆڵینەوە لەسەر کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی ئاڵۆزتر دەکات کەتا ئەمڕۆش جیاوازییەکانی بیروڕاو گفتوگۆکان بۆ دەستنیشانکردنی لایەنە گرنگەکانی بەدەوریداو بەدەوری قۆناغەکانیشیدا خولدەخوات[٤].

ئەگەریش حوکمدانی لەمجۆرە سەبارەت بەگرانیی لێکۆڵینەوە لەسەر دەرەبەگایەتی گشتگیربێت، ئەوا سەبارەت بەڕۆژهەڵات شێوازێکی ئاڵۆزتر وەردەگرێت، ئەمەش وای لەزۆربەی مێژوونووسان کردووە لەبنەڕەتەوە نکوڵی لەبوونی پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکان لەڕۆژهەڵاتدا بکەن، کەئەوەش لەسەر بنەمای ئەو ناکۆکییە روون و حەتمییە بووە کە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا لەنێو کۆمەڵگا ئەورووپایی و ڕۆژهەڵاتییەکاندا هەبووە، بەدڵنیاییش دژواری و ناکۆکیی لەوجۆرە لەتەفاسیلدا، تەنها دەرەبەگایەتیی نەگرتووەتەوەو تایبەت نەبووە بەو، بەڵکو پێشو پاشی کەوتووە.

کۆمەڵگا سەرمایەداری و سۆسیالیستییەکانیش لەیەک کاتدا لەنێو خۆیاندا بەیەکیش دەچن و جیاوازیشن، لەیەک دەچن لەڕووی نهێنییە بنەڕەتییەکانیانەوە کەدەستنیشانی چوارچێوەی گشتیی پرەنسیپ و سیستەمەکانی دەکات، بەحوکمی کات و شوێنیش جیاوازن. سەبارەت بەدەرەبەگابەتیش لەگەڵ ئەو هەموو جیاوازییە مێژووییە دیاریکراوانەو ناکۆکییەکانیش بەپێی شوێن، ئەوا بوونی دوو مەرجی سەرەکی پێویستن کەسروشتی پەیوەندییەکانی بەرهەم دیاریدەکەن بەو پێیەی ئەو سیستەمەی کەهەیە دەرەبەگایەتییە، ئەوانیش یەکەمیان بەگەڕخستنی چینی باڵادەستە بەوەی خاوەنی زەوین، دووەمیشیان بەگەڕخستنی ئەو خاوەندارییەتییەیە لەڕووی ئابوورییەوە بەشێوەی پارچە زەویی بچووکی کشتوکاڵی، واتا بوونی ئابووریی سەربەخۆ لای جوتیار بەندە بەموڵکییەتی سەردارانی خاوەن زەوییەوە (دەوڵەت یاخود سەرداران) لەبەرامبەر قازانجێکی دیاریکراودا، کەئەوەش لەقۆناغی پێشوودا بوونی نەبووە.

لێرەدا ئەرکی توێژەری سیستەمی دەرەبەگایەتی لەڕۆژهەڵاتدا ئاڵۆزتر دەبێت کاتێک ئامانجی لێکۆڵینەوەکەی یاخود توێژینەوەکەی کۆمەڵگا نیمچە داخراوەکانی لەنموونەی کۆمەڵگای کوردیی پێشوو دەگرێتەوە. ئەوەشی کەزیاتر توێژینەوەکە گرانتردەکات ئەوەیە کەپەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکان لەکوردستاندا تاڕادەیەک چەند شێوازێکی لەخۆگرتووە، بەشێوەیەک کە لەسەرەتاکانی سەدەی ناوەڕاستداو تا پێش چەند دەهەیەکی کەمیش لەناوخۆی کۆمەڵگای کوردیدا چەند یەکەیەکی مەشاعی و یەکێکی تری کۆچەری پێکەوە دەژیان ئەوەش گەواهییەکە بۆ لەدایکبوونی پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکان[٥]، سێهەمیشیان ئەوەبوو کەتیایدا دیاردەی دەرەبەگایەتی لەکامڵبوون نزیکبووەوە تا لەسەدەی ڕابردووترەوە بچووایەتە قۆناغی هەڵوەشانەوەو شیبوونەوەوە، کەهەموو ئەوانەش لەو ڕەوشە بابەتییانەوە کەوتنەوە کەبەواقعی ناوچە کوردییەکان و سروشتەکەیەوە پەیوەستبوو، سەرباری ئەوەش بۆ پەیوەندییەکانی و کارلێکردنەکانی لەگەڵ کۆمەڵگاکانی تری دەوروبەری دەگەڕێتەوە، کەهەر هەموویان گیمێکی شارستانیی دوورتر لەخودی کۆمەڵگای کوردییان بڕی.

ئەوەش ڕۆڵی هەیە لەدیاریکردنی گرنگیی کتێبی (سەبارەت بەمەسەلەی دەرەبەگایەتیی لەنێو کورددا) کەدەچێتە ڕیزی یەکەمی هەوڵە زانستییەکان کەم وێنەکانەوە، کەلەو بوارە پڕ دڕکوداڵەدا ئەنجامدرابێت[٦]. لەلایەکی ترەوە ئەم کتێبە بەبەشدارییەک دادەنرێت لەزنجیرەیەک لێکۆڵینەوەی زانستیدا، کە لەلایەن ژمارەیەک زانای سۆڤیەتییەوە بەمەبەستی شیکردنەوەی کۆمەڵگا مێگەلییەکان

---

٤-بۆ نموونە باباسی مارکسییەکان بکەین، ئەوانەی جیا لەکەسانی تر لەڕووی تیۆرییەوە بەشێوەیەکی شمولی لێکۆڵینەوەیان لەسەرکردووە، کە بەگشتی سەبارەت بەچەند بابەتێکی دیاریکراو کەپەیوەندیی ڕاستەوخۆی بەو سیستەمە کۆمەڵایەتییەوە هەیە ڕێک نەکەوتوون. تائێستاش گفتوگۆ زانستییە بەرفراوانەکان لەنێو زانا کۆمەڵناسە مارکسییەکاندا سەبارەت بەمەسەلەی پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکانی وڵاتانی ڕۆژهەڵات هەر بەردەوامە.

٥-لەهەندێك لەوڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا، لەوانەش هەندێك لەناوچە کوردنشینەکان، پرۆسەی لەدایکبوونی پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکان و گەشەکردنی، نزیکەی دە سەدەی خایاندووە، ئەوەش ماوەیەکی درێژە ئەگەر بۆنموونە بەراوردکرا بەو ماوەیەی کە لەئەورووپای ڕۆژئاوا خایاندوویەتی.

٦-لێرەدا دەبێت بەشێوەیەکی تایبەتی ئاماژە بەو زنجیرە توێژینەوە پێش وەختانە بدەین کەمێژوونووس و ئەتنۆگرافیست (و.ڤلچیڤیسکی) لەو بوارەدا لەبارەی بە(بابەتگەلێك سەبارەت بەمێژووی پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکان) پێشکەشیکردووە، ئەتنۆگرافیای سۆڤیەتی، لینینگراد، ژمارە ٥-٦، ١٩٣٢، ل١٢٠-١٤٠، (ئابووریی مەشاعیە کشتوکاڵییە کوردییە کۆچەرییەکانی ئەودیو قەفقاسو دەوروبەری لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا)، ئەتنۆگرافیای سۆڤیەتی، ژمارە ٤-٥، ١٩٣٦، ل١٣٥-١٦١.. چەند توێژینەوەیەکی تر. (هەروەها بڕوانە پەراوێزی ژمارە (٢٥) لەبابەتی "پێگەی ئەویا لەناو هۆزی کوردیدا" لەبەشی داهاتوودا بکە).

ئەنجامدراون، بەتایبەت لەئاسیای ناوەڕاستدا، کەئەوەش لەچوارچێوەی کارێکی جدیی هەمەلایەنەدایە بەئامانجی بنیاتنانی بەسوودترین هۆکاری مامەڵەکردن لەگەڵیدا[7] هەر لەبەر رۆشنایی واقعی کۆمەڵگای کوردیدا خاوەنی کتێبەکە هەوڵیداوە ئەو بابەتە زانستییە بسەلمێنێت کەزانا سۆڤیەتییەکان لەچلەکانی سەدەی رابردوودا ورووژاندبوویان سەبارەت بەبوونی ئەوەی کەناوی (دەرەبەگایەتیی کۆچەری)یان بەسەردا بڕیبوو[8].

جگە لەگرنگیی کتێبەکە، لەبەر ئەو هۆیانەی دەستنیشانمانکردن، هەروەها لەبەر ئەو مەعلوماتە بەهادارو بەرهەمە زانستییانەشی کەئەو کتێبە لەخۆی گرتووە کەشایانی بایەخپێدان و سەرنجن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کتێبە ژمارەیەکی زۆر کەموکورتیی تێدایە، کەهەوڵدەدەین تیشکی زیاتر بخەینەسەر گرنگترین لایەنەکانی هەروەك دەیبینین، ئەوەش بەمەبەستی پێشکەشکردنی وێنەیەکی روونتر سەبارەت بەو بابەتە.

ئەم گشتاندنەش بەپشتبەستن بەو تایبەتمەندییانە دێت کە لەسەرووی ئەو رێگرانەوەیەو رووبەڕووی هەر کەسێك دەبنەوە کەدەیەوێت لێکۆڵینەوە لەسەر کیانی کۆمەڵایەتی و پەیوەندییە ئابوورییەکانی کوردستان بکات. زۆربەی ئەوانەشی توێژینەوەیان لەسەر ئەم بابەتە دڕکاوییە کردووە سەرجەم تێڕوانینەکانیان و ئەوەشی هەڵیانهێنجاوە لەسەر بنەمای واقعی باوی ناوچەیەکی دیاریکراوی کوردی بنیاتناوە، پاشان زۆربەی کات هەوڵیانداوە بەسەر رووبەرێکی فراواندا بیگشتێنن، کە بەحوکمی رەوشە سروشتییەکەی و واقعە مێژووییەکەی، چەند توێژێکی کۆمەڵایەتی لەخۆ دەگرێت کەزۆر ناکۆکن[9]. هەروەها ئەوەش لەکتێبەکەی (أ. شامیلۆڤ)دا تێبینیی دەکەین کە لەتێکەڵکردنێکی ئاشکرای نێوان گشتی و تایبەت خاڵی نییە، بەڵام ئەم شتە سەبارەت بەدانەر تاڕاددەیەکی زۆر هەر تەنها ئەم لایەنە بیانوودارە ناگرێتەوە، چونکە ئەو لەپاڵ ئەوەشدا لەلایەنێکی تیۆریی تەواوەوە ئەوە هەڵدەبژێرێت کە لەبەرژەوەندیی کوردە، بۆ نموونەش ئەو هەوڵدەدات ئەوەی کە (س. أ. یگیزارۆڤ)[10] دەیڵێت بەدرۆی بخاتەوە، کەگوایا کورد لەڕابردوودا (کۆمەڵێکی پەتریارکیی-باوکسالاری)ی دیموکراسییان پێکدەهێنا، کەسەرجەمی خەڵك-دەوڵەمەندەکانیش بەهەمان شێوەی هەژارەکان یەکسانبوون لەمافداو وەك یەك مافیان هەبووە[11]. ئەوەی راست بێت ناکرێت وتەکەی یگیزارۆڤ بەسەر گشت ناوچەکانی کوردستانی سەدەی نۆزدەدا بگشتێنرێت[12]، لەهەمان کاتیشدا راستیش نییە پێچەوانەی ئەوەش بەسەر گشت ئەو ناوچە کوردییانەشدا بگشتێنرێت کەتا چەند دەهەیەکی رابردووش لەو نموونانەی یگیزارۆڤ باسی لێوەدەکات خاڵی نەبوون[13].

هەر لەو لایەنەشەوە دانەر لەزۆربەی هەڵسەنگاندنەکانیدا سەبارەت بەپەیکەری کۆمەڵایەتیی گوندنشینی کورد لەواقع دووردەکەوێتەوە، بەڵکو تەنانەت لەچوارچێوەی گشتیی چەمکی

---

٧-پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر، لێکۆڵینەوەو توێژینەوە لەسەر کۆمەڵگاکانی ئاسیای ناوەڕاست بووە کارێکی سیاسی-کۆمەڵایەتی، جگە لەوەی ئەوە کارێکی زانستیی گەورەش بوو. لێرەشەوە سەرنجی زاناکان بەرەو ئەو لایە راکێشرا، بۆ ئەو مەبەستەش تیمی تایبەت بەلێکۆڵینەوە لەسەر کۆمەڵگاکانی قیرغیزیاو هی تریش دروستبوون. هەروەها لەدەرەوەش لێکۆڵینەوەکانی زانا سۆڤییەتییەکان کۆمەڵگا کۆچەرییەکانیشی گرتەوە، کەتیایدا سەبارەت بەهەندێك مەسەلەی گرنگ لەو بوارەدا بەچەند ئامانجێکی هاوشێوە گەیشتن.
ڤ.تادارۆڤ-یش یەکێك لێکۆڵینەوەکانی بۆ توێژینەوە لەتایبەتمەندییەکانی پەیوەندییەکانی بەرهەم لەنێو هۆزە کۆچەرییەکانی ئێراندا تەرخانکرد، کەتیایدا چەند بابەتێکی دیاریکراوی تایبەت بەکۆمەڵگای کوردیی بەسەرکردووەتەوە، لەو رووەشەوە (أ. شامیلۆڤ) پشتی بەچەند بیروڕایەکی بەستووە. (ڤ. تادارۆڤ، تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی پەیوەندییەکانی بەرهەم لەنێو هۆزە ئێرانییەکاندا- "چەند بابەتێك سەبارەت بەگرفتە نەتەوەییە کۆلۆنیالییەکان"، مۆسکۆ، ژمارە ٢ (٩)، ١٩٣٢). هەروەك (ی.پ. پترۆشیڤسکی)یش لەلێکۆڵینەوەکەیدا سەبارەت بە"کشتوکاڵ و پەیوەندییە کشتوکاڵییەکان لەئێرانی سەدەی سیانزە-سەدەی چواردەدا"، مۆسکۆ-لینینگراد، ١٩٦٠).چەند لایەنێکی گرنگی هەمان بابەتی بەسەرکردووەتەوەو لای خۆیەوە لەژمارەیەك مەسەلەی توێژیوەتەوە، کەتایبەتە بەکۆمەڵگای کوردی لەو سەردەمە مێژووییەدا.
٨-ئەم زاراوەیە لەلایەن (ب. ڤلادیمیرتسوڤ)ەوە دانراوە، پاش ئەوەی لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر کۆمەڵگای مەنگۆلی کردو تیایدا دەریخست کەچۆن گەشەی دەرەبەگایەتی کاریگەریی هەبووە لەبزواندنی مێژووی مەنگۆلیادا، لەماوەی نێوان هەردوو سەدەی یانزەو بیستدا (بۆ زیاتر زانین بڕوانە توێژینەوەکەمان سەبارەت بە"دەرەبەگایەتی و لێکۆڵینەوەکانی لەعیراقدا"، کە لەگۆڤاری ئافاق عەرەبیەدا بڵاوکراوەتەوە، ژمارە چوار، ١٩٧٥، ل٢٢-٢٩).

٩-خودی ئەو واقعەش بەسەر زۆربەی کۆمەڵگا دەرەبەگایەتییە شاخاوییەکانی جیهانیشدا دەچەسپێت، لەوانەش کۆمەڵگا ئەسکەندناڤییەکانی سەدەی ناوەڕاست.
١٠-(س. أ. یگیزارۆڤ) یەکێکە لەدەرکەوتووترین ئەتنۆگرافیستە ئەرمەنییەکانی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە، کەپەیوەندییەکی بەتینی لەگەڵ کورددا هەبووەو زمانی کوردییشی باش زانیوەو چەندین دەقیشی لەکوردییەوە وەرگێڕداوەتە سەر زمانی روسی و بەهاوبەشیش لەگەڵ (ل. پ. زاگۆرسکی) دا (فەرهەنگێکی روسی-کرمانجی) و یەکێکی تری (کرمانجی-روسی) یان لەساڵی (١٨٩١)دا داناوە. دیراسەی تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگای کوردیی کردووە لەگەڵ رەوشە ئابووری و ئیدارییەکەیداو ژمارەیەکی زۆر لەتوێژینەوەکانی بۆ تەرخانکردووە، وەك: (لێکۆڵینەوەیەکی ئەتنۆگرافیی پوختی کوردەکانی حوکمداریی یەریڤان)، (بڵاوکراوەی بەشی رۆشنبیریی کۆمەڵەی ئارخیۆلۆژیی روسیی ئیمپراتۆری)، کتێبی سیانزەهەم، چاپی دووەم، تفلیس، ١٨٩١. بڕوانە وتارەکەی (عەبدولڕەحمان مەعروف) سەبارەت بە (س. أ. یگیزارۆڤ) لە(گۆڤاری بەیان)دا، ژمارە ٣٤، ئاداری ١٩٧٦، ل١-٤.
١١-لاپەڕە (١٠) ی دەقی کتێبەکە.
١٢-لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەداو لەهەندێك لەناوچە کوردنشینەکاندا ژمارەیەکی بەرفراوان دەرەبەگی رۆژهەڵاتی هەبوون، ئەو سەروەت و سامانە شەخسییەی سەرۆك عەشیرەتی حەیدەرانلی کویر حسین پاشا لەو کاتەدا بەزیاتر لە(١٥٠) هەزار لیرەی تورکی دەخەملێنرا، کەئەوەش مەبلەغێکی قەبە بوو بەپێی (هێزی کڕین-القوة الشرائية)ی ئەو کاتە کەلیرەی تورکی هەیبووە، هەروەها نزیکەی (٣٠٠) گوندیشی لەبەردەستدا بووە، سەبارەت بەسەرەك هۆزی جەبرانلی-یش لەو کاتەداو لەژێر فەرمانی ئەودا نزیکەی (٨٠) هەزار کەس لەکاردابوون، تواناکانی ئیبراهیم پاشای مەلی-یش بەزیاتر لەوە دەخەملێنرا (لەبارەی ئەو ناوبراوەوە بڕوانە پەراوێزی ژمارە (٦)ی هەمان بابەت "لەتایبەتمەندییەکانی دەرەبەگی کوردو سەرەتاکانی تەقینەوە"، لەبەشی داهاتوودا).
١٣-بۆ نموونە لەهەندێك (ئەو ناوچانەی شوێن نیشتەجێی ئەقشبەندییەکان بوو) ناوچەکانی بادینان و هەندێك لەبەشکانی دەرسیم و هی تر.

تیۆرییش کە بەهۆیەوە ڕێی ڕاست دەدۆزرێتەوە. لەوتەکەشیدا سەبارەت بە(دابڕانی چینایەتیی لەنێو پاسەواناندا) ئەوانەی سەر بەسەرەك هۆزە کۆچەرییەکان بوون[14] پێدەچێت زیاتر بەخراپ باسکردنی شتەکە بووبێت، چونکە ڕەوشە ئابووری و کۆمەلایەتییەکانی کوردستان و سروشتی ژیانی کۆچەری تییاندا کە لەواقعدا ڕێی بەدابڕانی پێش وەختی لەو جۆرە نەدەدا تا ئەوە ڕووبدات و لەبەر ڕۆشناییدا دەرئەنجامی لەو جۆرە بەشێوەیەکی گشتگیر وەدەستبهێنرێت. لەو حاڵەتەشدا ئەوەی بتوانرێت تا ئەوپەڕی قسەی دەربارە بکرێت، دەرکەوتنی ناکۆکییەکی کەمە لەموڵکداریەتیی تاك و تاڕادەیەك پێگەیەکی هەڵکەوتووی مەعنەویی توێژێکی بچووکە کەتاکەکانی ئەو چینە یاخود ئەو توێژە، ئەوانەن کەسەرۆك متمانەیان پێدەکات و پشتیان پێدەبەستێت.

لەهەموو بارێکدا بابەتی (دابڕان) کەدانەر باسی لێوەدەکات شێوەی ناکۆکییەکی بەڵگە نەویستی وەرنەگرتووە، یاخود ئەگەر لەهەمووشیدا نەبووبێت، لەزۆربەی ناوچە کوردنشینەکاندا نەبووەتە بزوێنەرێك و ئەو کاریگەرییەی نەبووە. خودی پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکانیش لەو کاتەدا ئەو قۆناغەی تێ نەپەڕاند کە لەپاشاندا جیاوازییەکانی نێوان هەردوو جەمسەری کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی ڕووبەڕووی یەك دەبنەوە، واتا لەنێوان سەرۆك-خاوەن زەوی و مسکێن یاخود جووتیاردا[15].

جارێکی تریش هەر لەخودی هەمان ڕوانگەوە زۆرجار دانەر لەوێناکردنەکانیدا سەبارەت بەژمارەیەك لەبەرپرسیاریەتیی دەرەبەگایەتی لەواقع دووردەکەوێتەوە، "ساڵانە کۆکردنەوەی سێ بار داری سووتاندنیش بۆ ئاغا" لەهەندێك لەو ناوچە کوردنشینانەی کە بەدارستانێکی سروشتی داپۆشراون و هەندێکیشیان زۆر چڕن شتێکی ئەوتۆ نییە شایانی باسکردن بێت، لەکاتێکدا ئەوە بەڕای (أ. شامیلۆڤ) بەئەرکێکی زۆر قورس و گرانی دادەنێت[16]. ئەو دانەنیشتنی دەستوپێوەند لەحزوری ئاغادا بەدیاردەی جیاوازی و ناکۆکیی لەقەڵەمدەدات لەنێو هۆزدا، لەکاتێکدا "دانان و جێهێشتنی سەرجەم چەکەکان لەهەندێك کاتدا لای خان یان بەگ و ئاغا" تەنها بە(دەربڕینی ملکەچی و دڵسۆزی لەخزمەت سەرۆك هۆزدا) دەبینێت[17]. لەواقعیشدا ئەمەی دوایان دەشێت بەڵگەیەکی زیاتر لۆژیکی بێت بۆ وێناکردنی دیاردەی جیاوازی و دەستبەسەرداگرتن و زۆرداری، لەگەڵ ئەوەی دانان و جێهێشتنی چەك جیا لەبەهاو نرخەکەی سەبارەت بەژیانی

١٤-بڕوانە ل١٩-٢٠ لەدەقی هەمان کتێب.
١٥-بەمانا گشتییەکەی زەوییە کشتوکاڵییەکان و لەوەڕگاکان و هی تر.
١٦-بڕوانە لاپەڕە (٢٨)ی دەقی کتێبەکە.
١٧-بڕوانە لاپەڕە (١٩-٢٠) لەدەقی کتێبەکەدا.

هۆزگەرایی، شتێکە ڕەوشێکی دیاریکراو سەپاندوویەتی، وەك ترس لەدزین، یاخود بەکارهێنانی بۆ مەبەستی پێچەوانەی ئەو مەبەستەی کەسەرەك هۆز دەیەوێت (بۆ نموونە تۆڵەسەندنەوە).

دووبارە لەم بوارەدا شامیلۆڤ باس لەوە دەکات کەبازرگانان "بەپێی خۆیان ڕەوشی ڕەندەرانی کوردستانیان ئاڵۆزکردووە"، بەڵگەشی بۆ ئەوە ئەوان "پیشەوەرە بەتواناو بەهرەمەندەکان ناچاردەکەن تا کار بۆ ئەوان و لەپێناو ئەواندا بکەن"[18].

نکوڵی لەوە ناکرێت کەبازرگانەکان لەڕێی (سوود-سوو)ەوە ڕەوشی جووتیاری کوردییان ئاڵۆزتر دەکرد[19]، ئەوەش لەو ماوەیەی کەئابووریی ئەوەی دواییان واتا جوتیاران بەپێی ئاستی بەرهەمهینان نەبوو و لەسنووری سروشتیی خۆی دەردەچوو[20]، لەگەڵ ئەوەشدا لەهەمان کاتدا ئەوان ڕۆڵێکی پێشەنگیان بینی کاتێك بەهۆکاری ئاڵوگۆڕکردن گۆڕان لەنێوان گوندو شاردا، کەئەوەش بووە هۆی چالاککردنی بەرهەمهێنانی پیشەیی و زیادکردنی ئاڵوگۆڕی نەختینە. ئەگەریش ئەو شتە گەشەی بکردایەو لەڕێڕەوی سروشتیی خۆی دەربچووایە، بەدڵنیاییە یاریدەی خێراترکردنی پرۆسەی شیبوونەوەو ڕەوینەوەی پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکانی دەداو دەکرا ڕوودانی گۆڕانکارییە ناوخۆییەکانیشرەوشەکەیان ئامادە بکردایە ئەگەرچی هێواشیش بووایە بۆ گواستنەوە بەرەو قۆناغە کۆمەلایەتییە بالاکان. لەگەڵ ئەوەی تێکەڵبوون بەبازاڕی سەرمایەداریی جیهانی بووە هۆی نەهاتنی ئەوە، بەتایبەت لەبەرئەوەی سەبارەت بەبەرهەمهێنانی پیشەیی بۆ لێدانێکی کوشندە گۆڕا. دووبارە ئەوەی ڕای دانەر پێچەوانەدەکاتەوە نەبوونی بەڵگەیە کەئاماژە بەبێزاریی پیشەوەران و بەشداریکردنیان دەکات لەڕاپەڕین و بزوتنەوە جووتیارییەکاندا کەکوردستان بەخۆیەوە بینیویەو بەتایبەت ئەوانەیان کەدانەر زۆر بەکورتی بسیکردوون.

بەلام هەروەها پێویستە ئاماژەش بەوە بدەین لەگەڵ ئەوەدا دانەر بەتەواوی لەسەرمەسەلەکانی (دابڕانی چینایەتی) لەنێو هۆزدا سوورە، جگە لەسووربوونی لەسەر دیاردەکانی بەگەڕخستن تیایدا، سەرباری ئەوەش وەلامێکی ئەوتۆی لەبەرامبەر ئەو پرسیارە کۆمەلایەتی-سیاسییە گرنگەدا نەداوەتەوە ئەوەش: ئایاو کەی و

١٨-بڕوانە لاپەڕە (٢٧) لەدەقی کتێبەکەدا.
١٩-بڕوانە پەراوێزی ژمارە (٢٢) لەبابەتی (پێگەی ئەوبا لەنێو هۆزی کوردیدا)، لەبەشی داهاتوودا.
٢٠-(بەرهەمهێنانی سروشتی) ئەو بەرهەمەیە کەبۆ خۆبژێویی تەرخاندەکرێت نەك بۆ ئاڵوگۆڕو بازرگانی، ئەوەش یەکێکە لەسیفەتە ئابوورییەکانی سەردەمەکانی پێش دەرکەوتنی پەیوەندی و شێوازەکانی هەڵسوکەوتە سەرمایەدارییەکان لەبەرهەمهێناندا. لەگەڵ زیادبوونی ئاڵوگۆڕیشدا ئەم جۆرە بەرهەمهێنانە وندەبێت تابەرهەمهێنانی شمەك جێگای بگرێتەوە. لەهەندێك ناوچە جیاوازەکانی جیهانی سێشدا تائێستاش بەرهەمە جووتیارییەکان لەنێو شێوازی بەرهەمهێنانی سروشتی و شمەکدا ئاستێکی ناوەند داگیردەکەن.

چۆن و لەکوێ بەگەڕخستنی دەرەبەگایەتی گۆڕا بۆ هۆکاری بنچینەیی و یەکلاکەرەوە لەهێنانەکایەی ناکۆکیی قووڵ لەناوخۆی کۆمەڵگای کوردیدا..؟ ئایا ئەو ناکۆکییانە لەڕەوشی تایبەتیی کوردستاندا دەیتوانی چێوەیەکی گشتی بنیات بنێت بۆ بزوتنەوەی سیاسی لەناو کۆمەڵدا یان بەشێکی یاخود بەشەکانی. نکوڵی لەوە ناکرێت کەدەستنیشانکردنی ئەو شتانە بەشێوەیەکی بابەتی پێویستیی بەلێکۆڵینەوەی قووڵە لەچوارچێوەیەکی دیاریکراوو گشتگیردا، هەروەك چۆن ناشبێت دابپڕێنرێت لەسەرجەم ئەو هۆکارە کاریگەرانە یاخود ئەوانەیان کەدەیانتوانی کاریان بکردایەتە سەر دەستنیشانکردنی کاریگەرییەکانی بەنێگەتیڤ بێت یاخود پۆزەتیڤ. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دانەر کە لەگوند ژیاوەو لەقۆناغە هەستیارەکانی گۆڕانیشدا هاوچەرخی جووتیاران بووەو زیاتر



لەشۆڕش و راپەڕینێکی بینیوە[٢١]، پێویستبوو لەسەری رایەکی زانستیی روون سەبارەت بەو مەسەلە گرنگە بدات بەدەستەوەو لەپێشکەشکردنی وێنە فۆلکلۆرییەکانتیشدا کەمتەرخەم نەبووایە، چونکە سەرباری گرنگییشی پێویستیی بەباسکردنێکی زانستیی ورد هەبوو.

لەو مەسەلە گرنگانەی تر کە لەبەرامبەردا لەگەڵ دانەری کتێبی (سەبارەت بەمەسەلەی دەرەبەگایەتی لەنێو کورد)دا لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێت، رەفزکردنی تەواوی هەرشتێکی بۆرژوازییە، لەوانەش زانستی بۆرژوازییە. کتێبەکەی (پ. لیرخ)ـیش بەپێی بیروڕای شامیلۆڤ (سیاسەتی کۆلۆنیالیی ئەوروپایی رەنگپێدەداتەوە کە لەسەدەی هەژدەوە لەکوردستاندا پیادەکرا)[٢٢].

و. پ. لیرخ جگە لەیەکێك لەدەرکەوتووترین رۆژهەڵاتناسەکانی سەدەی نۆزدە هیچی تر نەبوو، یەکێك بوو لەو کەسانەی بەپلەی یەکەم لێکۆڵینەوە کوردییەکان لایەنێکی گەورەی جێ بایەخیان بوو و چەندساڵێکی تەمەنیشی لەخزمەتکردنێکی دڵسۆزانەدا بۆ ئەنجامدانی ئەو لێکۆڵینەوانەی بەسەربرد، بەشێوەیەك هاوڕێکانی ناوی (کوردە بچکۆلەکە)[٢٣]یان بەسەردا بڕیبوو. لەمیانەی کارە بەبەرەکانیشیدا پیوتەر لیرخ (١٨٢٨-١٨٨٤)ناوی زۆربەی دانراوە رۆژئاواییەکانی لەبواری لێکۆڵینەوە کوردییەکاندا کۆکردەوەو پێش زیاتر لەسەدەیەك سێ بەش لەدانراوەکانی[٢٤] بۆ توێژینەوە لەسەر کوردو وڵاتەکەیان تەرخان کرد، لەبەرامبەرئەوەشدا لەلایەن رۆژهەڵاتناسە سۆڤییەتییەکان و هەروەها جگە لەوانیش خۆی و کارەکانی بەرز نرخێنراو شایانیشی بوو[٢٥].

پێویستە ئەوەش بوترێت کەلیرخ هەر لەبنەڕەتەوە بیری لەهیچ ئامانجێکی کۆلۆنیالی نەکردبووەوە، لەبەر ئەوە ئەوەی کە لەبەرامبەریدا لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکرێت ئەوە نییە، بەڵکو هەوڵەکانیەتی سەبارەت بەئەسڵی کورد، کەشامیلۆڤ کتێبەکەی پێ رازاندووەتەوە. کە لەچاپ روسییەکەی کتێبەکەیدا کلدانییەکانی بەباپیرانی گەلی کورد داناوە..![٢٦].

٢١-مەبەست لەو شۆڕش و راپەڕینانەیە کە لەسەرجەم ناوچەکاندا تەقینەوەو دەیانتوانی کار لەکۆمەڵگای کوردی بکەن.

٢٢-بڕوانە لاپەڕە (٥) ی دەقی کتێبەکەدا.

٢٣-بڕوانە پ. م. دانتسیگ، رۆژهەڵاتی نزیك لەزانست و ئەدەبی روسیدا، بەزمانی روسی، مۆسکۆ، ١٩٧٣، ل٢٢٨.

٢٤-پ. لیرخ، لێکۆڵینەوە سەبارەت بەکوردە ئێرانییەکان و باوباپیرە کلدانییە باکوورییەکان، پترسبۆرگ، کتێبی یەکەم، ١٨٥٦، کتێبی دووەم، ١٨٥٧، کتێبی سێیەم، ١٨٥٨.

٢٥-سەرچاوەیەکی زۆر کارە زانستییەکانی لیرخ-یان لەبواری لێکۆڵینەوە کوردییەکاندا بەرز نرخاندووە، پاش مردنیشی لەساڵی (١٨٨٤)دا ئەکادیمیەی زانستیی روسیی ئیمپراتۆری ناميلکەیەکی لەسەر مێژووی ژیانی و هەوڵە زانستییەکانی بڵاوکردەوە، بەدواشیدا چەند لێکۆڵینەوەیەکی زۆری تر کەزۆربەی دەربارەی بایەخدانی ناوبراو بوو بەمێژوو کوردو زمانەکەی. سەرسامبوونی ك. ك. کوردۆییڤ-یش بەلیرخ گەیشتە رادەیەك وای دانا کە (یەکێکە لەگەورەترینی زانا روسییەکانی سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە)-(بڕوانە ك. ك. کوردۆییڤ، کارەکانی پ. ی. لیرخ لەلێکۆڵینەوە کوردییەکاندا). سەبارەت بەمەسەلەی لێکۆڵینەوەی مێژوو کورد لەڕوسیادا، لەکتێبی "چەند لێکۆڵینەوەیەك لەمێژووی رۆژهەڵاتناسیی روسی"، مۆسکۆ، ١٩٥٩، ل٢٩).

٢٦-بەم شێوەیە پیوتەر لیرخ هەر سێ بەشی کتێبەکەی ناونا، لەگەڵ ئەوەشدا کەزۆر بەکەمی باسی لەپەیوەندییە مێژووییەکانی نێوان ئەسڵی کوردو کلدانییەکان کردووە. پێشدەچێت خودی لیرخ بەخێرایی هەستی بەو هەڵەیە کردبێت کەتێی کەوتووە، لەبەرئەوە دەبینین بەشی یەکەم و دووەمی کتێبەکەی

ئەگەریش دانەر هەندێك بیانووی هەبووبێت لەو هەڵوێستە[٢٧] و هەروەها لەهەوڵە توندەکانیشیدا بەمەبەستی دروستبوون و گشتاندنی بەگەڕخستنی دەرەبەگایەتی و دابڕانی چینایەتی لەگوندە کوردییەکاندا، ئەوا هیچ پۆزشێکی نییە لەبەرامبەر ئەوەی کەباسی لەو لایەنە خراپەی بەگەڕخستن نەکردووە کە بەشێوەیەکی تایبەت لەڕەوشی بەشێکی بەرفراوانی جووتیارە ئەرمەنییەکاندا لەسایەی دەسەڵاتی دەرەبەگە کوردەکاندا دروستبووە[٢٨]، کەئەگەر ئەوەش بەشێوەیەکی هەمیشەیی نەبووبێت ئەوا زۆربەی جار وێنەیەکی روونی بۆ سیستمی کۆیلایەتی و پەیوەندییەکانی پێکدەهێنا. لێرەشدا پێویستە لەسەرمان کەئاماژە بدەین بەوەی سامانێکی دەوڵەمەندی سەرچاوەی ڕەسەن و جۆراوجۆر لەو بوارەدا لەبەردەستی دانەردا هەبووە، کە لەبەردەستی کەسی تردا نەبووە.

مادامەکی دەربارەی ئەرمەن دەدوێین، ئەوا رایەك لەڕاکانی أ. شامیلۆڤ پێویستیی بەگفتوگۆ هەیە، کەئەوەش تایبەتە بەوەی کەسەبارەت بەکوردەکانی یەریڤان باسیدەکات ئەوانەی کەبەدانیشتووانە ڕەسەنەکەی دایناون، بیانووی بۆ ئەوەش ئەوەیە کە"لەبەڵگەنامە مێژووییەکەی شەرەفنامەدا"[٢٩] ئاماژەیەکی روون هەیە بەوەی کەبابوباپیرانی سەلاحەدین کەدەچێتەوە سەر هۆزی (راوەند) لەسەدەی دەیەمدا لەناوچەی دوین-ی نزیك بەیەریڤان کۆچەری بوون[٣٠]. بەڵام دێرینیی گەلانی ناوچەکەو ڕەسەنایەتیی مێژووییان کەڕەگوڕیشەی بۆ دوورتر لەسەردەمەکانی هەزارەی یەکەمی زایینی درێژەی هەیە ئەم رایە پێچەوانە دەکاتەوە. واقعی نەتەوەیی و مێژوویی و ئایینیش هەر لەکۆنەوە دیوارێکی لەبەردەم دەستتێوەردانی کوردیی قووڵی پێش وەختدا دروستکردووە تا بگاتە دوورترین خاڵی وەك یەریڤان کەدوورترین بەشی ئەرمینیایە لەکوردستانەوە. ئەو زانیارییانەش کە لە (ئاناباسیس)دا هاتوون زەینەفون، ئەوەی کەدەگەڕێتەوە بۆ سەدەی پێنجی پێش زایین، بەڕوونی ئەو جیاکەرەوە سروشتییەی نێوان هەردوو ناوچەی نیشتەجێی کاردۆخییەکان و ئەرمەنییەکان دەردەخەن، بەشێوەیەك کەهەست بەتێکەڵییان ناکرێت[٣١]. لێرەدا بوونی کەمایەتییەکی کوردی لەناوچەی یەریڤاندا ئەنجامێکی سروشتیی (تیۆری کۆچ)ـە، کەمێژوونووسە بۆرجوازییەکان ئەو مژدەیە دەدەن، دەربڕینێکی شامیلۆڤ هەیە کەئەویش (واتا ئەو کۆچکردنە) ناچێتە بواری بزوتنی سروشتیی دانیشتووانەوە کەناوچەکە بەخۆیەوە بینیویە، بەڵکو تا رادەیەك لەئەنجامی ئەو گۆڕانکارییە پاشکەوتانەوە بووە بەحوکمی چەند هۆکارێکی دیاریکراو، کە لەسەرووشیانەوە دەسەڵاتی ئیسلام دێت لەو ناوچانەدا، هەروەها ستەمکاریی عوسمانییەکانیش لەدواییدا.

سەرنجی زۆریش لەو توێژینەوەیدا بواری بەدانەر نەداوە بەقووڵی ئەو کێشە گرنگانە دەربخات کە لەکتێبەکەدا هاتوون،هەر لەدەرئەنجامی ئەوەشەوەیە کەبەخێرایی و هەندیك جار بەشێوەیەکی پچڕ پچڕ لەبابەتێکەوە بۆ بابەتێکی تر دەچێت، کەئەوەش شڵەژانێکی لەچارەسەرکردنی ژمارەیەك بابەتدا دروستکردووە کە لەکتێبەکەدا هاتوون و باسکراون، ئەوەش بەشێوەیەکی تایبەت لەپێناسە دووبارەبووەکان و هەندێك جاریش جیاوازەکاندا روونەبێتەوە، کەدانەر لەمیانەی توێژینەوەکەیدا سەبارەت بەهەندێك پێکهاتە هۆزگەرا تایبەتەکان پێشکەشی دەکات لەبارەی (اوبا-هوبە)و (الجول و الپیگار) و هی تر[٣٢]. هەروەها دانەر بەڕێگایەکی زانستی سەبارەت بەو سەرچاوانەی ڕۆژهەڵاتناسەکان ئەوانەی راکانیان بەکاردەهێنێت یاخود دەربارەیان گفتوگۆیان

---

بەزمانی ئەڵمانی و لەژێر ناونیشانێکی جیاواز لەناونیشانە روسییەکەدا بڵاوکردووەتەوە، کە بەئەڵمانی کتێبەکەی بەناوی (لیکۆڵینەوە سەبارەت بەکوردو کلدانە باکوورییە ئێرانییەکان)ـەوە بڵاوکردووەتەوە: ( Forschungen uber die Kurden und die iranischen Nordchaldaen). جیاوازیی نێوان ئەو دوو ناونیشانەش، لەڕوانگەیەکی زانستیی تەواوەوە، زۆرو روون و ئاشکرایە، هەرچەندە ناونیشانە ئەڵمانییەکەش شایانی گفتوگۆیەکی زانستییە.

٢٧-مێڵی فکریی باوی ئەو کاتەی یەکێتیی سۆڤیەت بەوە دەناسرا کەسروشتێکی توندڕەوو دژ بەهەرچی شتێکی بۆرژوازییە، لەوانەش بۆرجوازیی نیشتمانیی گەلانی تێکۆشەر، ئەوەش بەپێی ئەو وتە ستالینییە زانستییەی کەدەڵێت: (بۆرجوازی ئاڵای خەباتی فڕێدا) (!).

٢٨-بەشێکی زۆری جووتیارە ئەرمەنییەکان لەلایەن دەرەبەگە کوردەکانەوە رووبەڕووی ناشیرینترین جۆری بەگەڕخستن بوونەوە، کە لەسەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیددا گەیشتە لوتکە. سەبارەت بەو بابەتەش بەزۆربەی زمانەکان بابەتی ڕەسەن و جیاواز بەدەستدەکەون، بەتایبەت بەزمانی ئەرمەنی کەدانەر بەباشی دەیزانێت (سەبارەت بەم بابەتە بڕوانە فەسڵی پێنجەمی کتێبەکەمان "کوردستان لەساڵەکانی جەنگی جیهانیی یەکەمدا"، (چاپی دووەم، بەغداد، ١٩٨٤، ل٢٣٥-٣٠٢).

٢٩-ئەم پەراوێزە نەنووسراوە.

٣٠-بڕوانە لاپەڕە ٦-٧ لەدەقی کتێبەکەدا.

٣١-ئەو زانیارییانەی لەئاناباسیس دا هاتوون بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا یارمەتیدەربوون لەدەستنیشانکردنی ناوچەی نیشتەجێبوونی کاردۆخییە دێرینەکان. زەینەفون لەکتێبەکەیدا ئاماژە بەڕوباری (کینترینا-کەروباری بۆتانە کەیەکێکە لەلقەکانی دیجلەی باکوور) دەدات وەك سنوورێکی جیاکەرەوەی نێوان ئەرمەن و کاردۆخییەکان لەسەدەی پێنجی پێش زاییندا (بڕوانە: زەینەفون، ئاناباسیس، وەرگێڕانە روسییەکەی، مۆسکۆ-لینینگراد، ١٩٥١، ل١٠٠-١٠٢،٢٦٩). ئەوەی کەشایانی تێبینیکردن و ڕێزیشە ئەوە کەمامۆستا سەلاح سەعدوڵلا وایدەبینێت کەپێدەچێت زەینەفون مەبەستی لەناوی (کینترینا) یەکێك لەسێ لقەکەی دیجلە: جولەمێرك یان بۆتان، یاخود خاپور بووبێت (بڕوانە: زەینەفون، گەڕانەوەی دە هەزار سەرباز بەکوردستاندا، وەرگێڕانی سەلاح سەعدوڵلا، بەغداد، ١٩٧٣، ل٢٦).

٣٢-پێناسەکانی ئەم پێکهاتانە، لەمەتنی خودی کتێبەکەدا هاتوون.

لەگەڵ دەکات، هیچ زانیارییەکی تەواوی نەداوە[٣٣]،ئەوەش وادەکات تێگەیشتنی وردی هەندێك شت کە لەکتێبەکەدا هاتووە گران بێت، نەك هەر سەبارەت بەخوێنەرێکی ئاسایی، بەڵکو هەروەها سەبارەت بەکەسانی تایبەتمەندو پسپۆڕیش. هەربۆیە بەپێی توانا هەوڵماندا ئەو بۆشاییە پڕبکەینەوە.

لەکتێبی (سەبارەت بەمەسەلەی دەرەبەگایەتی لەنێو کورددا) چەندین کێشەی تر هەن کەپێویستییان بەگفتوگۆو روونکردنەوە هەیە، هەر بۆیە وامان بەباشزانی لەشێوەی قسە لەسەرکردندا قەتیسی بکەین سەبارەت بە ناوەرۆکی وەرگێڕانەکەی، هەموو ئەوانەش هیچی لەگرنگیی کتێبە زانستییەکە کەمتر نییە وەك هەوڵێکی پێشەنگ کەخاڵی نییە لەتێڕوانینی قووڵ و پڕە لەدەرئەنجام و زانیاریی گرنگ کە لەتوانایدایە وێنەیەکی باش لەسەر کۆمەڵگای دەرەبەگایەتیی کوردی ببەخشێت. هەروەها ژیانی دانەریش وەك کرێکارێکی کشتوکاڵی، کەهەر لەمنداڵی و گەنجێتییەوە بەهۆزەکان تێکەڵبووەو شارەزاییەکی بەرفراوانیشی لەسەر فۆلکلۆری کوردی، لەنزیکەوە بەشداریی لەناسینی چەندین کێشەدا کردووە لەلایەن خاوەن کتێبەکەوە.

### کورتەیەك لەمێژووی ژیانی دانەر

عەرەب شامۆییڤیچ شامیلۆڤ (عەرەبی شامۆ) لە(٢٣ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٨٩٧) لەگوندی سوسوزی سەر بەناوچەی (قارس) لەدایکبووە. "باوکم دەچووەوە سەر تایەفەی شێخە یەزیدییەکان، بەڵام لەبەر هەژاریی ناچاربوو لای دەوڵەمەندە هاونیشتمانییەکانی و ئەرمەنی و یۆنانی و تورکەکان ببێتە شوان"-بەو شێوەیە نووسەر ئینتیمای خێزانیی خۆی وەسفدەکات[٣٤]. هەر لەمنداڵییەوە شامیلۆڤ رووبەڕووی هەژاری و نەداری بووەوە، هەر بۆیە بەناچاری هاتە مەیدانی کارەوە تا یاریدەی باوکی بدات، هەر بۆ ئەو مەبەستەش بوە شوان، پاشان رووی لەگوندی ئەلیکساندرۆڤ کردو لەوێ دەستی بەکارکردن کرد، لەقوتابخانەی گوندەکەش دەستی بەخوێندن کرد، پاشان لەیەکێك لەکارگەکانی هەمان ناوچەدا بووە کرێکار.

پاش هەڵایسانی جەنگی جیهانیی یەکەم و چوونە ناوەوەی هێزەکانی روسیا بۆ ناو خاکی دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی و راستەوخۆ لەزۆربەی ناوچەکاندا لەگەڵ کوردیشدا بەیەکدا تەقینەوە، ئیتر لەبەردەم شامۆدا هەلی کار رەخساو وەك وەرگێڕێك لای یەکێك لەکەرتە سەربازییەکان و بەرەکانی جەنگدا بەمووچەیەکی مانگانە کەبڕی (٢٥) رۆبڵ بوو دەستی بەکارکرد. دوای ئەوە پاش دوو ساڵ لەکارەکەی دەردەکرێت و پاشان بەرەو شارۆچکەی شاری (قامیش) دەڕوات و سەر لەنوێ دەبێتەوە بەکرێکار، هەروەك خۆی باسی لێوە دەکات، لەوێ بۆ یەکەمجار بەرێکخراوە شۆڕشگێڕییە نهێنییەکان ئاشنادەبێت کە لەو ناوچەیەدا دەستبەکاربوون، هەر بۆیە بەو هۆیەوە لەسەرەتای ساڵی (١٩١٧)دا دەگیرێت و زیندانی دەکرێت، لەو رووەشەوە شامۆ بەگاڵتەجارییەوە سەبارە بەو بەسەرهاتانەی لەزینداندا بەسەری هاتووە دەدوێ و دەڵێت: "کاتێك جەندرمەکان زانییان کەکوردم، کە بەبیروڕای ئەوانیش نابێت کورد بەڵشەفی بێت، هەر بۆیە بەهەمان دەستووری ئەوباشییە دواکەوتووەکان تێریان لێدام و پاشان بەرەڵڵایان کردم".

شامۆ بەڕووخانی سیستمی قەیسەر دڵخۆش بوو، پاشان چووە شاری ستاڤروپۆل، کە لەوێ وەك خۆبەخشێك چووە ریزی لەشکری سوورەوەو تاساڵی (١٩٠٠) بەشداریی لەچەند شەڕێکدا کرد[٣٥]، ئەو مەسەلەیەش بەسێ جار برینداربوون لەشەڕەکاندا کۆتایی هات، واتا بەرێژەی برینداربوونێك لەساڵێکدا، ئەوەش بەپێی وتەکانی خۆی.

لەسەردەمی نوێداو لەبەردەم (شوانی کورد)دا[٣٦] هەلی تازە رەخسا، پاش کۆتایی جەنگی دەستتێوەردانی روسیا لەلایەن هێزە بیانییەکانەوە، نێردرا بۆ پەیمانگای لازاریێڤ بۆ زمانە رۆژهەڵاتییەکان لەمۆسکۆو بەسەرکەوتوویی دەرچوو، پاش ئەوە ژیانی پڕ لەبەرهەمە رۆشنبیرییەکانی شامۆ دەستپێکرد، کەئیتر بەرەو یەریڤانی پایتەختی ئەرمینیای سۆڤیەتی چوو و لەوێ بەپشتبەستن بەئەلفبای لاتینی، چالاکانە بەشداریی لەدانانی ئەلفبای کوردیدا کرد، هەروەها لەدامەزراندنی خانەی مامۆستایانی سەرەتایی لاوانی کوردیشدا کەخۆی بووە یەکەم بەڕێوەبەری، هەروەها لەدامەزراندنی یەکەم رۆژنامەی کوردیشدا لەیەکیەتی سۆڤیەت بەناوی (رێیا تازە-الدرب الجدید) بەشداریی کردو بووە یەکەمین سەرنووسەریشی.

---

٣٣-بۆ نموونە دانەر لەلاپەرە (٦)دا ئاماژە بەناوی دانەرێك دەکات کەئەوەش شوپین-ی رووتەو هیچی تر، بێ ئەوەی بەتەواوی ناوی بهێنێت یاخود ئاماژە بەو سەرچاوەیەش بکات کەرایەك لەو رایانەی سەبارەت بەکورد لێوە هەڵێنجاوە.

٣٤-ئەوە لەنامەیەکی تایبەتدا هاتووە کە أ. شامیلۆڤ تیایدا پوختەی ژیانی خۆی تێدا باسکردووە، وەرگێڕیش پشتی بەسەربوردەی مێژووی ژیانی شامیلۆڤ بەستووە کە لەو نامەیەدا ئەوەی لەکاتی یەکتر بینینیاندا بۆ وەرگێڕ گێڕاوەتەوە..

٣٥-مەبەستی ئەو شەڕانەیە کە لەساڵانی جەنگی دەستتێوەردانی بیانی لەروسیای سۆڤیەتیدا هەڵگیرسان.

٣٦-ناونیشانی یەکێك لەدانراوە ناسراوەکانی ئەوەیە کەتیایدا چیرۆکی ژیانی تێدا گێڕاوەتەوە.

شامۆ لەگەڵ ناوەندە ڕۆژهەڵاتناسییەکان و دامەزراوەکانیاندا لەپەیوەندییەکی ڕاستەوخۆدا بوو، لەنێو ئەو ڕۆژهەڵاتناسانەش کەگرنگییان بەلێکۆڵینەوە کوردییەکان دەدا، بەشانازییەوە باس لەپەیوەندییەکانی بەئاکادیمیست (مار)ەوە دەکات[٣٧]، هەروەها ئەکادیمیست ئۆربیللی[٣٨].هەروەك دەریشدەکەوێت، هاندانی ئەوان و پەیوەندیی پێیانەوە کاریگەریی گەورەی لەسەر تێڕوانینە ڕۆشنبیرییە پێش وەختەکانی شاملۆ هەبووە. سەرەتاش (لەچلەکاندا) بەتوندی جەختی لەسەر ئەو مەسەلانە دەکردەوە کە بەلێکۆڵینەوە کوردییەکانەوە پەیوەستبوون، بۆ ئەو مەبەستەش زنجیرەیەك توێژینەوەو وتاری لەو بوارەدا بڵاوکردەوە[٣٩]. کەدەرکەوتووترینیان ئەو کتێبە بوو بەناوی (سەبارەت بەمەسەلەی دەرەبەگایەتی لەنێو کورددا)..



شامۆ یەکێك بوو لەقوربانییەکانی دەستی ئەوەی کە لەیەکیەتیی سۆڤیەتدا بە(سەردەمی تاك پەرستی) ناودەبرا، لەو پێناوەشدا نزیکەی دوو دەهەی لەپڕخێروبێرترین تەمەنی لەدوورخستنەوەدا بەسەربردووە.. "لەبنیاتنانی سەرجەم هێڵە ئاسنینەکانی سیبریادا بەشداربووم.." بەو شێوەیە باس لەو ماوە پڕ لەنەهامەتییانەی ژیانی خۆی دەکات. لەگەڵ ئەوەدا نەچەمی و کۆڵی نەدا، کاتێکیش بایەخیان پێدایەوەو بەرەو مەیدانی بیرو کاری بەبەرهەم گەڕایەوە، بووە چیرۆك نووسیك کەئەدەبی کوردی کەسی وەك ئەوی بەخۆوە نەبینیبوو، بەڵکو لەوەدا بوو ببێتە تاکە چیرۆکنووس کەبەرەو لوتکەی ئەدەبی جیهانی ملبنێت و سەربکەوێت، چیرۆکەکانیشی وەرگێڕدراونەتە سەر ژمارەیەك زمانی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی.

---

٣٧-سەبارەت بە(مار)ی ئەکادیمیست، بڕوانە پەراوێزی ژمارە (٤) لەبابەتی (سەرەتایەکی مێژوویی)دا، لەبەشی داهاتوودا.

٣٨-یوسف ئەبگارۆڤیچ ئۆربیللی (١٨٨٧-١٩٦١) لەدەرکەوتووترین مێژوونووس و ڕۆژهەلاتناسە ئەرمەنییەکانی سۆڤیەتە، سەرۆکی لقی پەیمانگای گەلانی ئاسیا (کەئێستا ڕۆژهەلاتناسیی)یە لەلینینگراد، بەپلەی یەکەم سەرپەرشتیی و چاودێریکردنی تایبەتیی لێکۆڵینەوەو توێژینەوە کوردییەکانی دەکرد.

٣٩-دانراوەکانی تری لەو ماوەیەدا: (یایلا قیو اگمگان)، (سپێدەی ڕۆژهەلات)، تبلیس، ١٦ی ئایاری ١٩٢٦، (کوردەکانی ئەودیو قەفقاس)، (شۆڕش و ڕۆشنبیری)، مۆسکۆ، ژمارە ١٥-١٦، ل٨٦-٨٩. هەروەها ژمارەیەك دانراویشی بەزمانی کورد داناوە کەبۆ ئەو ماوەیە لەژیانی دەگەڕێتەوە، بۆ نموونە (ژیانی لینین)، ١٩٣٠.

# Erebî şemo 1897-1978

Zana û Ronakbîrî Kurd "Ereb Şemo" Salê 1897 Le gundî "Susiz" Î nawçey qarisî jêr deselatî dewletê Osmanlî, Le binemaleyekî Ser be Şêxanî "Êzîddastî" le dayîk buye. Sereta jiyanî be Şiwankarî be ser birdo we, û duwatir bo xwêndin çute Gundî " Kesenderov" û pêş serhidanî şoreşî uktoberî Salî 1917 Le Layen deselatdaranî ew serdemî Rosiya we xurawete zîdane we.

Duwey berpabonî şoreş, royî kirde şarî "ştav ropil" îbakorî Qeaqaz, û ço. we rîzî "partî Belşefî kewe" Le salanî 1920-1924 Peymangey xorhelatî le Mosko teweo Kirdo we, duwatir bû ye be nwênrî Komîtey Nawedî hîzbî komonîstî Ermenistan le yerîvan, Salî 1930 bûye be sernûserî rojnamey "Riyateze" ta Salî 1938, ew rojnamey be pîtî Latînî bilawkirdewe, u duwatir gurdiro be pîtî "Sîlavî" Rosî Salî 1932 le sarî "Lînîgirad" destî Kirdo we be xwendinî bala, û wa biryar bv tezî "diktora" namekey sebaret be kurd u ronakbîrî Kurd bêt. Belam Le Layan deselatdaranî "soviyet" u hukmî stalînewe dest gîr kiraûbo mawey (20) Sal berew "Sîbîriya" dur xirayewe. Salî 1946 her le "sîbîriya" Kîçekî Rûsî be hewserî jiyanî heldebijêrê, duway mirdinî " stalîn" gerayewe yerîvan û xwî bo karî Eolebiyat û nosîn terxan kird, wêray yekem hewlî Le bîstekan da bo dananî "elif û bêyekî Kurdî" be pişt bestin, be pîtî Latînî, zurbeynosînekanî Le govar û rojnamekanî ew demey Soviyet ola bilakirdutewe le biwarî nosînî romanada deçête astî nos ere nawdare kanî cihane we, Le berhemekanî romanî "Şivanî Kurd 1930, Berbang 1957, jiyanî bextewer 1959," Kurdanî Ermenistan 1961, bo duwa car malawayî le jiyan Kird.

# Erebê Şemo (Ereb Şamîlov) (1897-1978)

di 23.10.1897 de li gundê Susuzê li qeza Qersê, ku di wê heyamê de di bin destelatiya Rusyayê de bû, ji bav û diyeke rencber ji dayîk bû.

Wî ji deh saliya xwe de dest bi şivantî û xulamtiya axayê gundê xwe û dewlemendên cîran kir.

Erebê Şemo bi serkevtin xwendina xwe ya ewil diqedîne. Di sala 1913, dema ku 16 salî bû derbasî ser karê paletiyê dibe.

Di sala 1914 de wexta destpêka şerê hemcîhanê yê ewil hetanî sala 1917, Erebê Şemo ku xên ji zimanê dê, usa jî rusî, tirkî, zunanî û ermenî zanibû dibe tercumankarê parêzkarekî Rusan. Piştre jî demeke dirêj di komîteya navendî ya partiya komunîsta Ermenistanê de cih digire.

Di sala 1931 de Erebê Şemo li Leningradê rastî Qanatê Kurdo tê û hevaltiyeke baş di navbera wan de tê sazkirin. Ji wir dest bi xebata literaturî û ilmî dike. Li wê derê nivîsên di derheqa problemeên zimanê kurdî de hazir dike û li Ermenistanê çap dike.

Di sala 1937 de ji aliyê Stalîn ve tê sirgûnkirinê, wî dişînin kenarê Okêrna cemidî. Heta sala 1956 ew li wê derê dimîne.

Piştî mirina Stalîn ew aza dibe û careke din vedigere Ermenistanê.

Sala 1966 ew romana xwe ya dîrokî Dimdim belav dike. Sala 1967 jî ew li Moskovayê berevoka Hikayetên Gelê Kurd, û romana xwe ya bi navê Riya Bextewar neşir dike.

Li Sêntora Yêrîvanê ser dîwarê makke ku Erebê Şemo salên xwe yên dawiyê li wê derê derbas kiribû, usa hatiye nivîsandin: "di vê malê de ji sala 1963-1978 emrê xwe derbas kiriye rewşenbîrê Kurd û karkerê muxulqeiyê Erebê Şemo Şamîlov"

Berhem

- *Şivanê Kurd* - roman, 1977
- *Dimdim* - roman, Weşanên Roja Nû, 1983, ISI 917672008-X.
- *Jiyana Bextewar* - roman, Weşanên Roja Nû, 19 ISBN 917672030-6.
- *Hopo* - roman, Weşanên Roja Nû, 1990, ISI 917672029-2.



# Hepeyvinek di Erebe Semo re

Bave Naze

Ji bo bîranîna nivîskarê kurd, ErebŞemo, gerek em çi bikin? Bi darxistina şevan? Wê başba. Bi belavkirina nivîsên wî? Wê baş û başba...Lê ku hemû bi hev re, êdî ev dibû xwesteka herî bi nirx û hêja. Helbet, ev jî bi kirin û derfetên me girêdayî ne... De emê xwe bê hêvî nekin û emê bêjin, li gora ku bê xwestin, emê sedsaliya nivîskarê xwe li gora meqamê wî pîroz bikin. Ev jî gerek baweriyek be...

Bi xwe xwendevanên me pê dizanin, ku nivîskarê kurd Ereb Şemo sala 1897' an ji dayîka xwe bûbû.Û sala 1978' an çûbû ser heqiya xwe... Hîn berî wefata wî, biçend salan (sala 1972-an) min bi komek hevalên xwe re, ew li Lênîngradê dît. Vêga ew bi firehî li ser xebata xwe ya edebî, civakî û siyasî axivî. Û bi taybetî li ser girtina xwe...

Weke nas e, di heyamê Stalîn de, di salên sîhî de, gelek Bolşevîk hatin girtin û kuştin. Yek ji wan jî Ereb Şemo bû. Ew ji sala 1937'an heya 1953'an, li Sibîriya demekê, di zindanê de bû û surgunkirî bû. Li gora gotina Ereb Şemo, sebeba nemirina wî, bedenê wî yê bi hêz bû.

Em pê dizanin ku Ereb Şemo, di wexta girtina xwe de, pelpelûka xwe ya herî bilind ji temenê xwe yê berhemî derbas dikir. Em pê nizanin, heger ew nehata girtin, wê çi berhemên din pêşkêşî me bihata kirin. Di vir de gerek ez bêjim ku di wê rûniştina me ya pê re, wî got wekî, ewî bîranîna xwe nivîsandiye û bi firehî li ser jiyana xwe ya li surgunê û ya di zindanê de, rawestiyaye. Li gora gotina wî, ew bîranîn di erşîvên Partiya Komûnîstên Ermenîstanê de veşartîne...

Tê bîra min, vêga yekî ji me, ji Ereb Şemo pirsî:

-Mamoste, di pirtûka we de hatiye nivîsandin ku we Lenîn dîtiye. 'awa û Kengî?

Ereb Şemo, bi firehî, bersiva vê pirsê da mixabin, wê wextê min bersiva wî ne nivîsî. Lê piştî vê pirsê min bi xwe çend pirs jê kir û di eynê wextê de, di deftera xwe de nivîsand. Hezîrana sala 1978'an, dema nivîskarê me çû ser heqiya xwe, min ev hevpeyvîna jêrîn, ku sala 1972'an pê re çê kiribû, di kovara "Rêber" de, bi zimanê erebî, hate belavkirin. Niha jî cara pêşîn, bi zimanê kurdî, pêşkêşî xwendevanên "Axîna Welat" dikim.

Vêga min pirsên xwe bi kurtahî jê pirsî, ewî jî bi kutahî bersiva min da.

- Mamoste we kengî dest bi nivîsê kir?
- Ji ber hoyên dijwar ên ku welat tê de derbas dibû û ji ber çewisandina netewî û stemkariya çînî, min bi derengî dest bi nivîsê kir. Yanî piştî sîh salî ji temenê xwe.
- Hûn bi kîjan zimanî dinivîsînin?
- Bi zimanê kurdî û ez bi xwe jî werdigerînim ji bo zimanê rûsî. Carna jî, ez ji tercimanan re dibin alîkar.

-Hûn çawa fêrî xwendin û nivîsandina zimanê kurdî bûn?
- Hûn pê dizanin ku gelê me ji hemû mafên xwe mehrûm bû. Loma jî, min bi zimanê xwe nexwend. Lê piştî Şoreşa Oktoberê, bi alîkariya hinin hevalan, ez fêrî zimanê xwe bûm. Û dûre, min bi xwe jî, elîfbaya kurdî ya bi tîpên kîrîlî danî.

- Gelo, ji berhemên we yên edebî kîjan ya pêşî bû?
- "Riya Şoreşa Oktoberê" ya pêşî bû, min ew di sala 1930'an de nivîsîbû.

- Ji berhemên we, kîjan ya herî şêrîn, li ber dilê we ye?

- "Riya bextiyariyê" (Dimdim), li ber dilê min +êrîn e, lê ya rast jê bêtir "Şivanê Kurd". Lê belê, ji ber ku ew li ser jiyana min e, ez çêlê nakim.

- Gelo, hûn helbestan dinivîsînin?

- Erê, lê ji bo xwe.

- Rêbazê we yê edebî jîjan e û Çima?

-Rêbazê min ê edebî, riyalîzma sosiyalîzmê ye. Lê çima? Ji ber ku ez bi xwe riyalîst û sosiyalîst im. Û di nerîna min de, ev rêbaz dikare hemû aliyên jiyanê ruhnî bike.

Di vir de ew bişirî û berdewam kir:

-Hûn rexnegir, ji nivîskaran bêtir dikarin li ser vê yekê biaxivin, cirîd cirîda we ye.

-Nerîna we li ser edeba kurdî çi ye?

-Edeba kurdî, edebeke xwedî nirx e, lê mixabin wenda ye. Ew jî, wek mirovê kurd li welatê xwe rê li ber tê girtin. Lê belê, wê rojek bê ku edeba kurdî geşbûyî be.

-Hûn dikarin, hejmara berhemên xwe ji me re bibêjin?

-Min heft roman, çend kurteçîrok û hinin şano nivîsandiye.

-Niha, çi planê we û nivîsandinê hene?

-Îsal (sala 1972-an), min "çirûskên Şoreşa Okteberê" xelas kir û nêzîk wê bê weşandin. Û niha jî min dest bi romana"Şerê Tarîlka" kiriye. Ev roman dîrokî ye, bûyerên wê li Kurdistana Tirkiyeyê diqewimin. - Qewetiya we ji bo nivîskarê nuhatî çi ye?

-Xwendin, dîsa xwendin û ez careke din dubare dikim xwendin.

Bi kurtî, vêga min ew tişt nivîsîbû û niha jî pêşkêşî we dikim. Û hûn pê dizanin ku Ereb Şemo ji mêj ve ji nav me bar kiriye. Lê ya baş, ez vê nivîsê bi gotina wî bi xwe bibim serî: "Ew kesê ku jiyana xwe, ji bo gelê xwe derbas dike, ewê tucarî neyê ji bîrkirin."

Axîna Welat hejmar, 53,1997, Moskova
Du Şaşiyên Stratêjîk yên Tevgerên Kurdî

Ezê, li ser wê yekê ku problema me, di cîhanê de, problema herî aloz e, ranewestim. Her weha jî ku em kurd bi çavên herî sivik li pirsa xwe dinerin, li ser vê yekê jî ezê neaxivim... Ev pirsên ha pir axavtinê dixwazin û her yek li gora xwe dikare vê yekê rave bike... Lê pirsên stratêjî, pir konkirêt, zelal û vekirî ne... Her çî em kurd, pir tevlihev, pir bi gotin in û kêm bi tefkîr in. Ji xwe kambaxî di vir de ye.

Rojekê mirovekî biyanî, di derheqa kurdan de got: "Ez dîna xwe didim kurdan, ew pêşî dikin û dûre difikirin." Ev jî, di hemû waran de wêranî ye. Dibe ji ber vê çendê, em her dem wêran dibin û têk diçin. Kirin pêşî û tefkîr paşê, ji xisletên nezaniyê ne û ji xwe nezanî her tim bûye perçak ji dîroka jiyana me. Ev jî, nîşana li paşmayîna me ye...

De ka em dîsa konkiret, bi awakî matematîk bêne ser pirsa xwe. Gelê meçar perçe ye. Bê maf e. Tiştekî eşkere ye, gerek em ji perçebûnê, derbasî yekîtiyê bibin. Gerek gava pêşî, ji vê dest pê bibe. Ev xwesteka ha ne nuh e û ne veşartiye. Her kes dibîne û her kes dizane. Li gel vê yekê jî, li cem me kurdan, tiştê herî dijwar e. Diyar e, yekîtiya di bin sîwanek netewî de, wê ne riyal be jî. Ji ber ku gelek destên xerîb di nav me de hene û gelek berjiwendî, li xaka welatê me dighên hev. Û ji hemûyan kêmtir, em berjiwendiya gelê xwe û welatê xwe nas dikin. Loma jî, ji hemûyan bêtir em ji vî welatî kêm pehr in...

Ev diyardeyên ha, hemû bi hev re, dihêlin ku em ne li gora qonaxan bin û piştî ku trên derbas dibe, em bi pey dikevin. Di vî warî de, her kurdek pê dizane mêweyên nestewyayî, yan ne xweş in yan jî nayên xwarin. Û mêweyên bihurî jî, ew jî yan ne xweş in yan jî telef dibin. Di jiyana xwe ya rojenî de, em carna bi dîqet li vê yekê dinerin, lê di xebata netewî de, em pir xemsar in. Ji ber vê xemsariyê, em xêza stratêjî li gora qonaxê wenda dikin... Gelo, xêzên stratêjî yên li gora qonaxa serdemî çi ne? Di nerîne min de, du xêz in:

1- Di şerê himberî tirkan de, bi eniyeke netewî ji hêzên her çar perçeyên Kurdistanê.

2- Guhertina qada şer.

Ji bo ji hevderxistina van her du xalan, pêwîstiya xwe bi ravekirinekê heye. -Ezê hewl bikim ku bi kurtahî bersiva vê yekê bidim...

Weke nas e, ji her çar dewletên ku Kurdistan, di nav xwe de perçe kirine, Tirkiye dewleta herî bi hêz û xwedî bandor e. Weha jî eşkere ye, heya ku tirko neçar nebe û mafên kurdan nede, ewê perçeyên din (heger hinin maf bêne stendin, wê her nîvco bin û di bin tehlûketê de bin,) loma jî gereke Tevgera Rizgarîxwaza kurdî, êrîşa xwe bibe ser xeleka herî xurt, ji dewletên dagirker. Berevajiya şoreşa sosyalîzmê ku di teoriya xwe de êrîşa xwe dibe ser xeleka herî lewaz!

Bi xwe şaşiya tevgerên me ew bû ku wan hêzên xwe li perçeyên din belav dikirin û bi yek dengî li himberî tirkan ranedibûn. Ji tecrîba xwe ya dîrokî gerek em bizanibin, heya ku rejîma tirk, wek asteng, ji pêşiya me ranebe, tu carî emê negihên armanca

xwe ya pîroz. Loma jî, ji me tê xwestin, em bi yek eniyê, bêyî ku em sînorên perçebûnê qebûl bikin, li hemberî tirkan rawestin û di hemû waran de, şerê wan bikin û ziyanê bighînin berjewendiya wan. Bi avekirina Eniyek Netewî, êdî gerek em derbasî stratêjiya nuh bibin, ew jî guhertine qada şer e...

Guhertina qada şer, ji bo me kurdan taktîk e, yan stratêjî ye? Di nerîna min de, li gora hoyên îro, ev pirsa ha, pirsa stratêjî ye û ji kevirên qorzîbirê ye. Heger di heyamê berê de, şerê bi dijmin re, me tenê dikaribû, li ser axa xwe vî şerî bikin, îro gerek em giraniya xwe bidin ser qada di hunderê dijmin de!

Paradoks e, lê rast e, di Tevgerên Rizgarîxwazên Netewî yên li cîhanê, tenê, Tevgera Kurd dikare, di hundirê dijmin de şerê xwe bike. Lê tiştekî seyr e, kurdan ev qoz bi karneanîne û ku bi kar hatibe jî di çarçovek pir teng de. Erê, ji gelên Efrîqa Emerîka Latinî û yên Asyayî tenê kurd, bi dijminên xwe re, di yek bajarî de û heya di avayakê de bi hev re dijîn.

Lê di şerê xwe de, bi dijmin re çi dibû û em çi dikin?

Ji dîroka serhildanên me tê nasîn hema ku hêzên digihîştin qonaxa serhildanê, berê xwe didan serê çiya. Bi vê yekê, xaka welatê xwe dikirin qadaşer û ya duyem jî, çarçova têkoşînê li xwe teng dikirin û xwe dûrî awirên raya giştî ya cîhanê dikirin. Bi xwe dijmin jî, li vê yekê digeriya. Bê rehm welatê me xera dikir û serheldanên me diperçiqand, bêyî ku kes bibihîze yan jî bibîne..

Erê, tiştekî seyr e, ew siyaseta cinasîda ku li hemberî me bi kar dihat, heya agahdariya me kurdan, ji perçeyê din çê nedibû. De wêçawa agahdariya me pê heba, heger me xwe di şikeft û geliyan de vedişart û şerê dijmin dikir?

Îro jî, em vê yekê dikin. Îro jî em van şaşiyan dikin. Îro jî, dijmin fena bêrê Kurdistan vala dikin û gelê me wek kêriyên pez ber bi metrepolan ve dişîne. Na, gerek em şaşiyên xwe dubare nekin. Dîrok pir ji dubarekirina şaşiyen aciz dibe. Dîrok hez ji dersgirtinê ji tecrîban dike. Gerek em vê yekê xweş fam bikin û bizanibin. Loma jî, ji bilî hebûna pêşmergan li serên çiyayên Kurdistanê, gereke komên me yên çekdarî şerên xwe li gund û bajarên dijmin jî bikin...

Niha bihar e, rejîma tirk, dîsa êrîşên xwe li himberî pêşmergên me xurt dikin. Ew wek her sal dixweze me biqedîne. Lê gerek em li hêviya êrîşa tirkan nemînin. Gerek em bi xwe jî, li ser xaka wan, êrîşên xwe bikin. Gerek em daristan û zeviyên wan bişewitînin. Gerek em terorê li bajarên wan bikin.Wan çawa welatê me li me kiriye dojeh, gerek em jî welatê wan li wan bikin jehr. Gerek em kurd xweş fam bikin, heya ku berjiwendiya gelê tirk ziyanê nebîne, ewê her wek perçak ji sistêma dewleta xwe bimînin...

Dijmin, rehmê li me nake, heger em rehmê lê bikin, tê wê wateyê ku em bê exlaqiyetê bi wan kesên ku xwîna wan bi destê dijmin hatine rijandin dikin. Xwîn pir hatiye rijandin û gereke xwîn bi xwînê bê şûştin. Dijmin bi vî zimanî, bi me re diaxive, gerek em jî bi vî zimanî bersiva wî bidin



# طريق الكاتب الكردي ( عرب شمو ) الى الأدب العالمي

جودت هوشيار

في آواخر كانون الثاني عام ١٩٧٧ احتفلت الاوساط الثقافية السوفيتية بالذكرى الثمانين لميلاد الكاتب الكردي البارز عرب شمو وقد اقيمت لهذه المناسبة حفلة تكريمية للكاتب في مدينة يريفان ± عاصمة جمهورية أرمينيا- القيت خلالها كلمات المؤسسات الثقافية والشخصيات العلمية والادبية البارزة في الجمهورية واتحاد الكتاب السوفييت والتي اشادت بالكاتب وانجازاته الابداعية ونشرت الصحف والمجلات المحلية و المركزية مقالات تتحدث عن النشاط المتعدد الاوجه لهذه الشخصية الثقافية الكردية البارزة. كما وجهت رئاسة اتحاد الكتاب السوفييت برقيةحارة و مطولة الى الكاتب نشرت في صحيفة " ليتراتورنايا غازيتا " وهي الصحيفة المركزية الناطقة بلسان الاتحاد , وتعد أهم وأشهر الصحف الادبية في العالم , وقد تضمنت البرقية الأشادة بمؤلفاته القيمة ووصفته بمؤسس وعميد الادب الكردي وواضع الابجدية اللاتينية للغة الكردية والشخصية ال! ثقافية والاجتماعية اللامعة وقد توجت هذه الاحتفالات بمنح الكاتب وساما" رفيعا" من مجلس السوفيت الأعلى وكانت لهذه الاحتفالات صداها العميق في نفوس المثقفين الكرد في كل مكان وقد نشر كاتب هذه السطور مقالة ( تضمنت اهم مراحل حياة الكاتب وابداعه مع بيبلوغرافيا كاملة بمؤلفاته في مجالات الادب واللغة والاجتماع والاقتصاد والسياسة وترجمة النص الكامل لبرقية اتحاد الكتاب السوفيت ) فى مجلة(شمس كردستان)التى كانت تصدرها(جمعية الثقافة الكردية فى بغداد انذاك)(١) .

كانت هذه هي أجواء الاحتفال في عام ١٩٧٧ . أما في عام ١٩٩٧ حيث مرت الذكرى المئوية على ميلاد الكاتب وفي السنوات اللاحقة وخاصة بعد تفكك الاتحاد السوفيتي فقد اضطر قسم كبير من كرد ماوراء القفقاس ( جمهوريات ارمينيا وآذربيجان وجورجيا ) الى مغادرة مناطقهم التي عاشوا فيها على مر العصور وبخاصة اقليم قرهباغ بسبب الحرب الطاحنة التي نشبت بين جمهوريتي ارمينيا وآذربيجان للسيطرة علي هذا الأقليم والسياسة الشوفينية التي اتبعتها تلك الجمهوريات ازاء الكرد واختفت تماما تلك الانجازات الثقافية التي حققها الكرد خلال العشرينات من هذا القرن وانحسرالنشاط الفكري والادبي والفني الكردي الى حد كبير ومازالت جريدة " ريا تازة " اي " الطريق الجديد " تصارع من اجل البقاء ان لم تكن قد توقفت عن الصدور الأن حيث ان اخبار ابناء جلد تنا فى ما وراء القفقاس تصلنا في عصر الثورة المعلوماتية والاتصال الفوري بشق الأنفس وعلى اوقات متباعدة عن طريق الاتصالات الشخصية خلال الزيارات المتبادلة واذا كانت الظروف القاهرة للمثقفين الكرد في ماوراء القفقاس لم تسمح لهم بالاحتفال بمئوية عرب شمو او استذكار مآثره وانجازاته الابداعية في الذكرى العشرين لرحيله اوفى ذكرى يوم مولده او رحيله فأن عدم التفات الاوساط الثقافية الكردية داخل كردستان الى احد ابرز المبدعين الكرد خلال القرن العشرين له اكثر من دلالة، لعل في مقدمتها هذه الحواجز المصطنعة التي تجزأ ليس الوطن الكردي فحسب , بل الثقافة الكردية أيضا" . ومن عواقب هذه التجزئة عدم اطلاع القراء الكرد في أحد أجواء كردستان على أدب وثقافة أشقائهم في الاجزاء الاخرى أو في المهجر. لذا نجد ان نتاجات عرب شمو لم تنشر على نطاق واسع حتى في كردستان العراق التي تطورت فيها الثقافة الكردية أكثر من غيرها ( ! ٢ ) .

## الراعي الكردي الذي قابل لينين

ولد عرب شمو في ٢٣ كانون الثاني ١٨٩٧ في قرية " سوسز " الواقعة في مقاطعة ( قارس ) في كردستان تركيا --والتى احتلتها القوات الروسية لفترة من الزمن-- وهو ينتمي الى أسرة أحد شيوخ الأيزيدية واسمه الحقيقي الكامل ( عرب شمس الدين شامل ) ونظرا" للظروف القاسية التي كانت تمر بها اسرته اضطر في صباه ان يعمل في عدة مهن مختلفة فقد بدأ حياته العملية راعيا للماشية عند الاغوات الكرد والاثرياء الارمن والاتراك ثم عمل كأجير في احد المعامل وبالرغم من كل ذلك استطاع ان ينال قسطا من التعليم ويكمل الدراسة الاولية ( التي لم تكن مقسمة الى مراحل ابتدائية و متوسطة وثانوية وما يزال نظام الصفوف ذات السنوات العش معمولا" به في المدارس الروسية ) واغلب الظن ان عرب شمو قد درس في احدى المدارس الروسية في المنطقة حيث تعلم اللغة الروسية الى جانب اللغات الاخرى التي كان يعرفها ( الكردية , !

